ئەم کتێبە لە بنەڕەتدا تێزێکی ماستەرە کە پێشکەشی ئەنجومەنی کۆلێژی پەروەردە بۆ زانستە مرۆڤایەتییەکان لە ساڵی٢٠٠٤-٢٠٠٥ وەکو بەشێك لە پێویستیەکانی پلەی ماستەر لە زمانی کوردیدا


## خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

- **ڕۆنانی رستە لە شێوەزاری فەیلیدا**
- **نووسینی: ئاسۆ عەبدولڕەحمان کەریم**
- **سەرپەرشتی نامەکە:** د.قەیس کاکل تۆفیق
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال رواندزی
- **بەرگ:** رێمان
- **نرخ:** ٣٠٠٠ دینار
- **چاپی یەکەم** ٢٠١٤
- **تیراژ:** ٧٥٠ دانە
- **چاپخانە:** موکریانی (هەولێر)
- **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی(٥٦٩)ی ساڵی (٢٠١٢) پێدراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٨٣١)**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com
**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

**پێشکەشە بە:**

- (دایك وباوك)ی خۆشەویستم
- (مەهاباد )ی خوشکم
- (مەحەمەد و مەحموود و ڕۆستەم و ئاکۆ)ی برام
- ئەوانەی بە گیانی کوردانە دەی خوێننەوە
- کتێبخانەی کوردی

# سوپاس و پێزانین

**- سوپاس بۆ یەزدانی پاك و تەنیا ، کە تەمەن و یارمەتی دام بۆ تەواوکردنی لێکۆڵینەوەکەم .**

**ڕێز و سوپاس و پێزانینم بۆ:**

- مامۆستای سەرپەرشتیارم ( د.قەیس کاکل تۆفیق ) ، ئەرکی سەرپەرشتیاری نامەکەی گرتە ئەستۆ و ئازادی بۆچوونی پێم بەخشی لە نامەکەدا.

- ئەو مامۆستا خۆبەخشانەی لە کۆرسی خوێندنی باڵا وانەکانیان پێ ووتم: ( د.وریا عومەر ئەمین، د.گالب حوسێن ، د.کوردستان موکریانی ، د.یوسف شەریف ، د.سردار گەردی).

- (د.کەمال کەرکووکی ، د.مستەفا زەنگنە ، مامۆستا محەمەد خورشید تۆفیق ) هاندەرم بوون بۆ خوێندن لە خوێندنی باڵا .

- (د.گالب حوسێن عەلی) زانیاری بە سوودی گەیاندە نامەکە.

- مامۆستا (مەدحی مەندەلاوی) سەرچاوەی پێویست و زانیاری پێ بەخشیم بۆ دەوڵەمەندکردنی نامەکە.

- عەلی مەهدی ساڵح (عەلی فەیلی) و کوڕەکانی لە بۆچوون و نموونەکان یارمەتیان دام .

- کارمەندانی کتێبخانەی ناوەندی زانکۆی سەلاحەددین .

- مامۆستا سەلوا و مامۆستا سەرکەوت عەبدوڵڵا.

- دایك و باوك و خوشك و براکانم و ئەندامانیماڵەوە.

- هەموو ئەو مامۆستا و مرۆڤە نەمرانەی کە بە هێمایەك یان وشەیەك ژیانیان ڕووناکتر کردم.

# کورتکراوەکان:

| | |
|---|---|
| ئاو : | ئاوەڵناو |
| ئا.بەند: | ئامرازی بەند |
| ئا.پر : | ئامرازی پرس |
| ب. سا | بێ ساڵە |
| پە.ق.ن : | پەند و قسەی نەستەقی کوردی شاری خانەقین |
| ج. نەڤی : | جێناوی نەڤی |
| ج.سەربەخۆ : | جێناوی سەربەخۆ |
| ج.نیشانە : | جێناوی نیشانە |
| د.پ : | دیارخەری پێشەوە |
| د.د : | دیارخەری دواوە |
| ڕ : | ڕستە |
| ڕس : | ڕستەی سادە |
| لاڕ : | لاڕستە |
| س : | سەرە |
| ز.ك. ژ : | زاری کرمانجی ژووروو |
| ز.ك.خ : | زاری کرمانجی خواروو |
| س.پ : | سەرچاوەی پێشوو |

ش.ز : شێوە زار

ش.ز.ف : شێوە زاری فەیلی

ك.خ : كرمانجی خواروو

گ.ئا : گرێی ئاوەڵناوی

گ.ئاك : گرێی ئاوەڵكاری

گە.ئەڵ : گەردانەی ئەڵوەن

گ.بەند: گرێی بەند

گ.ك : گرێی كاری

گ.ن : گرێی ناوی

م.بەند : مورفیمی بەند

م.گ : مورفیمی گەیەنەر

م.لێ : مورفیمی لێكدەر

م.نا : مورفیمی ناسراو

م.نا.كۆ : مورفیمی ناسراوی كۆ

م.نەنا : مورفیمی نەناسراو

م.نەنا.كۆ : مورفیمی نەناسراوی كۆ

ن : ناو

# هێماکان

| | | |
|---|---|---|
| | : | پێك دێت لە .... |
| ★ | : | نارێزمانی |
| ∅ | : | دەرنەکەوتووە |
| ?? | : | ڕستەکە لە رووی واتاوە تەواونییە. |

# ناوەڕۆك

# پێشەکی

## ناونیشانی نامەکە:

نامەکە لەژێر ناونیشانی (ڕۆنانی ڕستە لە شێوە زاری فەیلی دا)یە، ئەم لێکۆلینەوەیە بۆ شیکردنەوە و لێکدانەوەی ڕستە لە شێوە زاری فەیلی دا تەرخان کراوە.

## کەرستەی خاوی لێکۆڵینەوەکە:

ئەو نموونە و دەربرینانەی وەك کەرستەی خاو لەم لێکۆڵینەوەیەدا بەکارهاتوون بەم شێوەیە دابین کراون:

بە پلەی یەکەم هەوڵمان داوە نموونەکان لە بەرهەمە چاپکراوەکان وەربگرین، کە بەم شێوە زارە بەڵاوکراوەتەنەوە. هەروەها بەرێژەیەکی زۆر پشتمان بەو ڕستە و دەربرینانە بەستووە کە لە قسەی نەستەق و پەندی پێشینانن، لە ناوچەکانی شێوە زارەکە بەڵاون ئەوەش لەبەر ئەوەی شێوەیەکی چەسپاویان وەرگرتووە و خەڵکەکەش پێی ئاشنان.

هەرچەندە دابین کردنی نموونەی پێویست لەم دوو سەرچاوەیە ئەستەمیش نەبێ کارێکی ئاسان نییە بۆیە ناچاربووین لەکاتی پێویستدا بۆ پاشە کەوتکردنی کات نموونە لەو کەسانە وەربگرین کە ئاخێوەری ئەو شێوە زارەن بۆ پاساوکردنی نموونەکان و دڵنیا بوون لە وەی کە دوورە لە کاریگەری شێوە زار یان زمانەکانی تر بۆ جاری دووەم و سێیەم بە خەڵکی تری ئەو شێوە زارە نیشان دراوە و گومانیان لە (فەیلی) بوونی نموونەکان نییە.

چوارچێوەی جوگرافی کەرستەی خاو و سنووری کارکردنمان تەنها ئەو شار و شارۆچکانە بوون دەکەونە وڵاتی عێراق.

## سنووری لێکۆڵینەوەکە:

ناونیشانی نامەکە سنوور بۆ بواری نامەکە دادەڕێژێ، کە بریتییە لە ڕۆنانی ڕستە، بەم پێیە سنووری لێکۆلینەوەکە بە گرێ دەست پێ دەکات و بە ڕستەش کۆتای دێ. هەر چەندە باوەڕمان بەوە هەیە، کە ڕستەی لێکدراو و ئاڵۆزیش هەمان ڕۆنانیان هەیە و دەچێتە ناو چوارچێوەی ناونیشانەکە.

## گرفت و هۆی هەڵبژاردنی نامەکە:

شێوە زاری فەیلی یەکێکە لەو شێوە زارانەی بە تێر و تەسەلی لێی نەکۆڵدراوەتەوە، سەرەرای ئەوەش کاری گەری هۆکارە دەرەکیەکانی گۆڕان لە زمان دا لە سەر ئەم شێوە زارە زۆرترە. هەر لە تێکەڵاو بوونی قسە پێکەرانی ئەم شێوە زارە بە زار و زمانەکانی تری وەك عەربی و فارسی تادەگاتە ڕاگوێزان و سرینەوەی ناسنامە، ئەمانە تارادەیەك تەنگیان بەم شێوە زارە هەڵچنیوە، بەرامبەر ئەمانەش فەرامۆش کردنی لەلایەن لێکۆلینەوەی ئەکادیمی بە لاسەنگی دەهێلێتەوە.

سەرەڕای ئەمانەش نا لەباری بارودۆخی سیاسی و پەرت بوونی ئاخێوەرانی، کە کاری یگەری لە سەر شێوە زارەکە زیاتر درووست دەکا. هۆکارێك بوون بۆ هەڵبژاردنی ئەم بابەتە.

## ڕێبازی لێکۆڵینەوی نامەکە:

ڕێبازی بەرهەم هێنان و گوێزانەوە بایەخ بە زار و شێوە زارەکان نادا و مۆدێلێکە لە سەر زمانی ستاندەر کاردەکات، ئەم لێکۆڵینەوەیە ئەگەر چی لە سەر شێوە زارێکە، بەڵام بە پەسەندمان زانی هەر لە سەر ئەم ڕێبازە وەسفی شێوە زارەکە بکەین و ڕۆنانی ڕستەی ئەم شێوە زارەی پێ بخەینە ڕوو.

## کورتەی نامەکە:

نامەکە لە پێشەکی و سێ بەش و پاشکۆ پێك هاتووە:

بەشی یەکەم: تەرخان کراوە بۆ دووان لە فەیلی یەکان و لایەنی رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و ئاینی و شوێنی شێوە زارەکە لە ناو زارەکانی زمانی کوردی دا ئەم بەشە دەبێتە دەروازەیەك بۆ بەشەکانی تر.

بەشی دووەم: تایبەت کراوە بۆ گرێ و پێناسە و جۆرەکانی گرێ و فراوانکردنی لە شێوە زارەکەدا. بەشی سێیەم: لەم بەشەدا جۆرەکانی ڕستە لە ڕووی ڕۆنانەوە خراوەتە ڕوو، هەوڵمان داوە هەریەك لە ڕستەکانی (سادە، لێکدراو، تێکەڵ) پێناسە و چۆنیەتی پێکهاتەیان بخەینە ڕوو، هەروەها بە کورتی باسمان لە جۆرەکانی ڕستە لە ڕووی مەبەستەوە کردووە، واتە ڕستەی (هەواڵ گەیاندن، پرسیار، فەرمان دان، سەرسوڕمان)، جگە لەوەی ناکردنی ڕستەمان بە یارمەتی مۆرفیمەکانی ناکردن بە نموونەوە باس کردووە، دواتر سەرچاوەکانمان خستۆتە روو.

# بەشی یەکەم

## ١- ١: فەیلی یەکان کێن؟

کەباس لەفەیلی یەکان دەکرێت دەبێت بچینەوە سەر (لوڕ[١])ەکان لەوێوە لەفەیلی بدوێین.

لوڕ زارێکی کوردی یەو بە کۆمەڵێکی گەورەی هۆزی کورد دەوترێت کە هەموو هۆزە کوردەکانی (لوڕی بچووك بە کەڵهور و لەك)ەوە دەگرێتەوە، هەروەها لوڕی گەورەش (بەختیاری، کۆهگلو، مامەسانی) دەگرێتەوە کە هەموو دانیشتوانی هەرێمی لوڕستانی کورد پەیوەندی نەتەوایەتی هۆزایەتی و پەیوەندی زمانی کوردی بەزاری کرمانجی باشوور لەگەڵ مێژووی هاوبەش و هەست و چارەنووسی نەتەوایەتی و ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری هاوبەش بەیەکیان دەبەستێتەوە [٢].

شەرەفخان دەڵێت: ((لوڕەکان دووبەشن لوڕی گەورە و لوڕی بچووك))[٣]

مەبەستی نووسەر لە لوڕی بچووك، واتە (لوڕی ڕەسەن)ە، یاخود(لوڕی فەیلی) یشی پێدەڵێن.

هەموو سەرچاوەکانی تر کە لە لوڕی بچووك دەدوێن مەبەستیان لە(لوڕی ڕەسەن)ە، واتە (لوڕی فەیلی) یە، ناوی هەریەکێك لەم ناوانە بێنن هیچ لە واتا ومەبەستی ناوەکانی تر کەم ناکاتەوە هەموویان یەك واتا دەگەیەنن.

(زبێربیلال) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات زاراوەی فەیلی زاراوەیەکی نوێیە لەمێژووی پێش سەدەی شازدەی زاینیدا بوونی نەبووە [٤].

---

١- حەمیدی ئێزد پەناه،لە ( فەرهەنگی لەك و لوڕ)، ل١٤ دەڵێت: ((وشەی (لوڕ) دانەری کتێبی (بەرگوزیدە) ی فارسی دەڵێت: ماناکەی بەکوردی (شاخی پرچرە دارستان) دەگەیەنێ)).

٢- فواد حەمە خورشید، لوڕ... دانیشتوانی هەرێمی باشووری کوردستانی ئێران ، ١٩٨٦: ٩٩

٣- میر شەرەف خانی بدلیسی، شەرەفنامە، ٢٠٠٦ : ٤٢

٤- زبیر بیلال، اللر ولورستان في المصادر الجغرافية العربية القديمة، ١٩٩٧: ٢٨

(تارا عەبدولاّ)دەڵێت: (پێشتر بە هەموو خەڵکی (پشتکۆ و ئیلام)یان دەوت کوردە فەیلییەکان، هەروەها ئەو کوردە دەرکراوانەی عێراق کە ریشە و رەگەزی خۆیان زۆرتر لە ناوچەکانی ئیلام و پشتکۆ (ناوچەی ئەرکەواز) یان دانیشتوانی ناوچەی لوڕستانی بچووکن [٥]).

بەبڕوای ئێمە (تارا عەبدولاّ) لەم بۆ چوونەی بە هەڵەدا چووە، چونکە:

(پشتکۆ و ئیلام)ی بە دوو ناوچەی جیاواز لە قەڵەم داوە. لەراستیدا پشتکۆ هەر ئیلامە، یەك ناوچەن ئەو ناوچەیە دوو ناوی جیاوازی هەیە، بە (پشتکۆ) یان (ئیلام) ناودەبرێت.

(ئەرکەواز) ناوچەنییە، بەڵکو هۆزێکە لەو هۆزانەی کە نزیکەی (چل) هۆزن لەناوچەی ئیلام نیشتە جێن.

## ١-١-٢: زاراوەی فەیلی لەچییەوە پەیدابووە؟

بۆ پەیدابوونی زاراوەی فەیلی بۆچوونی جیاجیا هەیە، هەوڵدەدەین ئەو بۆچوونانە بخەینەروو کە زیاتر دیارن و جێگای بایەخ و سەرنجن:

(مەدحی مەندەلاوی) دەڵێت: (بەبڕوا من کە د.کامل بصیریش ئەو باوەڕەی هەیە، والی ئیلام ناوی (حسین الخان العباس العلوی) بووە، والی (عەباسی و عەلەوی) بێت دەبێ ناوێکی عەرەبی بێت پێیان ووتوە (فئەالی) بە هۆی فۆنۆلۆژیەوە، (فئەالی) بووە بە (فییە الی) پاش سووانی دەنگی (همزە) گۆڕانی زیاتری بینیوە تا بووە بە (فەیلی)[٦].

(د.تاهیری) دەڵێت: زۆر رێگەی تێدەچێت کەزاراوەی (فەیلی) بەعەرەبی بووبێ و زاراوەی (پەهلی) یان (پەهلەای) فارسی، کەناوی ناوچەیەکە لە (زرین أباد - زەرین ئاوا)ە بە دەست هاتبێت، چونکە دەنگی (پ) لەنەژاد لای فارس بەکارهاتووە و دەنگی (ف) جێگەی ئەوی گرتۆتەوە، وەك لەوشەی (پارس) کە ئەمرۆ بۆتە (فارس)[٧].

---

٥- تارا عەبدولاّ، هەندێك لایەنی رێزمانی زاری فەیلی، ١٩٩٨: ٨.

٦- چاوپێکەوتن: مەدحی مەندەلاوی (١٢/ ٦/٢٠٠٧).

٧- جعفر ختیال، مجموعە اراء دەربارەء ساکنین سرزمین، پشتکوە ایلام، ١٩٩٠: ١٢٥ .

هەندێك دەڵێن: لەوشەی (فیـل)ەوە وەرگـیراوە، چـونکە  دانیشـتوانی ناوچـەی (پشـتگۆ) ڕاهێنانیان بە فیل دەکرد، ئەو (فیل)ە سـپی یـەی کـە سـەرکردەی سـوپای ئیسـلامی (ئـەبو عوبەیدە)ی لە شەڕی پرد (الجسر) شێلا ڕاهێنەرەکەی لە دانیشتوانی ئەو ناوچەیە بوو[٨].

(د.جەمال ڕەشید) دەڵێت: زاراوەی فەیلی لە نەژاد دا زاراوەیەکی کوردییە بریتی بووە لە (پەهلی) کە بووە بە فەیلی دەنگی (ه) گۆڕاوە بە دەنگی (ف) بەکاریگەری زمانی عەرەبی لەسەر وشەکە.[٩]

بۆ ئەو بۆ چوونەی کە دەڵێت: لەوشەی (فیل)ەوە هاتووە نووسەریش ئەو ڕەخنەیەی هەیـە کە لە ڕووی مێژووی یەوە شەڕی پرد مێژوویەکی نوێ یە.[١٠]

بۆچوونی (د.تاهیری و د.جمال) لێك نزیکن، بەڵام (د.جمـال) بەڵگـەی گـۆڕانی نـوێی لـە دەنگەکانی زمانی کوردی دەدات بە دەستەوە. دەڵێت: زمانی کوردی سەر بەکۆمەڵـە خێزانـی (هیند و ئاری)یە بۆ نموونە ئەمڕۆ لە  زمانی کوردی دەنگی (ه) بەرەو لە ناوچوون دەچێت وەك وشەی (دهێم) لە (ز. ك. خ) بووە بە (دێم یان تێم) [١١].

ئێمە ئەو بۆچوونە پەسەند دەکەین، چونکە لە (ز. ك. ژ) شوێنەواری ماوە، یاخود دەنگـی (ه) لە وشەکانی (نقسینگەها، خاردنگەها،... تاد) بوونە بە  (خواردنگە، نوسینگە)، کەچـی زمانی هیندی پێچەوانەی زمانی کوردی یە دەنگی (ه) لە  برەودایە .

### ١-١-٣ واتای زاراوەی فەیلی:

بۆچوونی جیاجیا هەیـە بـۆ واتـای زاراوەی فـەیلی:

ڕۆژهەڵاتناسـی بەریتـانی (کیرزۆت) دەڵێت: زاراوەی فەیلی واتای (پتە و توند) دەگەیەنێت[١٢].

(هینری فیلد)یش دەڵێت: واتای (یاخی بوو) دەگەیەنێت.[١٣]

---

٨- احمد  ناصرالفیلی، الكورد الفیلیون بین الماضي والحاضر، (ب، سا)،: ١٦

٩- چاوپێکەوتن: د. جەمال ڕەشید ، (٢٠٠٨/٣/٢٥).

١٠- احمد  ناصرالفیلي،  الكورد الفیلیون بین الماضي والحاضر، (ب، سا)،: ١٦.

١١- چاوپێکەوتن: د. جەمال ڕەشید، (٢٠٠٨/٣/٢٥).

١٢- عبدالجلیل فیلي، اللور (الكورد) الفیلیون في الماضي و الحاضر، ١٩٩٠: ١٠٣.

١٣- س. پ: ١٠٣

نووسەر و ڕەخنەگر (نوري ثابت) دەڵێت: سەرچاوەی سەرەکی ئەم وشەیە وەرگیراوە لە وشەی (فلات) یان (فلوات) لەعەرەبی وەرگیراوە بە واتای (زەوی ئاوەدانکردنەوە) دێت[14].

(د. جمال رەشید): زاراوەی فەیلی واتای شارستانی دەگەینێت[15].

### ١-١-٤: بارودۆخی رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی کوردە فەیلی یەکان:

کوردە فەیلییەکان وەکو هەموو گەلی کورد بەدرێژایی مێژوو لەلایەن دەسەڵاتدارانی عوسمانی و سەفەوی و عەرەبی چەوسانەتەوە و هەوڵی بێ هێزکردن و بن برکردنیان دراوە، فواد حەمە خورشید دەڵێت: هەرێمی لوڕستان بەبەرنامە لەهەموو لایەکەوە پشگوێ خراوە، بەتایبەتی لەرووی رۆشنبیری و خوێندن و ئابوورییەوە، لەرووی جوگرافیاوە لە هەموو خزمەت گوزاریەك بێ بەش کراون، سەرەرای ئەمانەش خەڵکی ناوچەکە هەوڵیان نەداوە بەزاری خۆیان فێری خوێندن بن، بۆیە ئەمە بۆتە هۆی ئەوەی خوێندنی فارسی تێدا بمێنێتەوە و گەشە بکات هەتاکو رۆشنبیری فارسی هەموو لایەکی گرتەوە و کاری زمانەوانی خۆی تێدا کردەوە و رۆشنبیری کوردی لە کزی دا و خەڵکەکە لێی کشانەوە بەمەبەستی مەزهەب گەری هەستی نەتەوەییان لای کوردەکان لاواز کرد و هانی شیعە گەری و پەلکێشکردنیان بۆ لای فارسی دەدا[16].

پێش جەنگی سەفەوی و عوسمانی ناوچەکانی لوڕستان بەتایبەتی ئیلام زۆر بەدەگمەن کاریگەری فارسەکان لە ڕووی زمان و کەلتوور لەسەریان هەبوو لەدوای هاتنی دانیشتوانی ئیلام بۆ عێراق، واتە ساڵی (١٩٢٦) فەیلی یەکان پێگەی گەورەی سەرمایەداری و رۆشنبیری و کۆمەڵایەتیان گرتە ئەستۆی خۆیان[17]. توانییان لەچلەکانی سەدەی بیستەم دا (کۆمەڵەی فە یلی) درووست بکەن وەك دەزگایەکی کۆمەڵایەتی، قوتابخانە و یانەی

---

١٤- ئی. جەی. ئار. هینری فیلڵد، هۆزەکانی کورد، ١٩٩٠: ١٥.

١٥- چاوپێکەوتن: د. جەمال رەشید، (٢٠٠٨/٣/٢٥).

١٦- فواد حمە خورشید ، زمانی کوردی دابەشبوونی جوگرافیای دیالێکتەکانی، ١٩٨٥ : ٣١ -٣٢

١٧- چاوپێکەوتن: مەدحی مەندەلاوی، (٢٠ / ٦ / ٢٠٠٧).

وەرزشیان کردەوە دەیەها کەسی وەك (سەلمان شکر، مصطفی جواد، زمانەوان کامل بصیر) یان تیا هەڵکەوت[١٨].

لە رۆشنبیریدا ژنانی فەیلی بێبەش نەبوون بۆ بزواندنی هەوێنی کوردایەتی لە ناویاندا (لەیلا قاسم) قوربانیدەری کوردانەیە. لەسەرەتای حەفتاکاندا نزیکەی (حەفتا هەزار) کوردی فەیلی لە دانیشتوانی شاری (بەغدا، باقوبە، شارەبان، خانەقین، مەندەلی، بەدرە، کوت) و چەندین شوێنی تر راگوێزران بەرە و ئێران[١٩].

تەنها بەتۆمەتی ئێرانی بوون بەعسیەکان لەسالی (١٩٧٢) نزیکەی (چل هەزار) کوردی فەیلییان دەرکرد کە سەدەها ساڵ بوو لە عیراق دەژیان[٢٠].

ئەمانە بوونە هۆی لاوازبوون و لە ناوچوونی بەشێکی گەورەی رۆشنبیری کوردە فەیلی یەکان. بەعسیەکان لەسەر ژمێری دانیشتوانی عێراق لە ساڵی (١٩٧٧) فەیلی یە کانیان لە کورد جیاکردەوە و بە نەتەوەیەکی سەربەخۆ لە قەڵەمیان دا [٢١] ♣.

### ١-١-٥: ئاینی کوردە فەیلی یەکان:

لەرووی ئاینی یەوە دەبێ لە ئاینی کۆنی لوڕەکان بدوێن کە بە پاشماوەی ساسا نیەکان (کاشیەکان) دادەنرێن، کە ناوی خواکەیان لە ناوی (کاش) هاتووە[٢٢]. پاشان وەك زۆربەی میللەتانی تر بوون بە موسڵمان بەلاٚم لەسەرمەزهەبی شیعە، هەندێکی تریان لە سەرمەزهەبی (عەلی ئیلاهی)[٢٣]. (مەدحی مەندەلاوی) دەڵێت: ئەمرۆ بە هەموو کوردەکانی باشووری کوردستان کە لەسەر مەزهەبی شیعەن دەڵێن (فەیلی)[٢٤].

---

١٨- د. سعید بشیراسکندر، الکرد الفیلیون و حزب البعث، (١٩٦٣، ٢٠٠٣): ٣٠- ٣١

١٩- مراد حکیم، سیاسەتی راگواستنی کورد لە کوردستانی عێراق، ٢٠٠٥: ١٩.

٢٠- هەژار، چێشتی مجێوەر، ١٩٩٧ : ٥٥٠.

٢١- د. عەبدوڵا غەفور، پێکهاتەی نەتەوەیی دانیشتان لەباشووری کوردستاندا بەپێ ی سەرژمێری دانیشتوانی عێراق (١٩٧٧) ، ٢٠٠٥: ١١.

♣ بۆ زانیاری زیاتر بروانە نەخشەی ژمارە (١).

٢٢- هیمدادی حوسێن، دەربارەی لوڕەکان، ١٩٨٦: ١١٤.

٢٣- محمد امین زەکی، کورد و کوردستان، ١٩٣١: ١٧.

٢٤- چاوپێکەوتن: مەدحی مەندەلاوی، (٢٠٠٧/٦/١٨).

### ١-١-٦: شوێنی شێوە زاری فەیلی لە ناو زارەکانی زمانی کوردی دا:

لە مەر دابەشکردنی زارەکانی زمانی کوردی، دابەشکردنی جیاجیای بۆ کراوە. ئـەوەی تـا ئێستا باوە یەکەم سەرچاوە لە زارەکانی زمانی کوردی کتێبی (شەرفنامە)یە، کە بە شێوەیەکی ساکار باسی لە تیرە و زارەکانی زمانی کوردی کردووە، وای راگەیانـدووە کـە کـورد لـە ڕووی زارەوە دەبنە چوار بەش

بەم شێوەیە[٢٥]:




(تۆفیق وەهبی) بیروڕای (شەرەفخان)ی شیکردۆتەوە بەم شێوەیە[٢٦]:




---

٢٥- شەرەفخانی بەدلیسی، ٢٠٠٦: ١٠٠

٢٦- تۆفیق وەهبی ، ئەشکەوتەکەی کەندۆك ، ١٩٥١ : ٣٢-٣٣

٢٧- لێرەدا تەنها لەو زارە دەدوێین کە شێوە زاری فەیلی بەشێکە لەوان .

جەمال نەبەز: زمانی کوردی بەسەر دوو کۆمەڵە زار دابەش دەکات :

**زمانی کوردی**

- دووشێوە بنچینەیی یەکە
  - کرمانجی سەروو
  - کرمانجی ناوەڕاست
- دوو شێوە لا تەنیشتەکە
  - کرمانجی خواروو
  - کۆمەڵەشێوەی گۆرانی-زازایی

**هەریەك لەم زارانە کۆمەلێ شێوەزار لە خۆ دەگرێت:**

**١- دوو شێوە بنچینەیی یەکە:**

أ) **کرمانجی سەروو:** بۆتانی، جەزیری، هەکاری، بادینانی، ئاشیتەیی، بایەزیدی.

ب) **کرمانجی ناوەراست:** سلێمانی، سنەیی، ئەردەلانی، کەرکووکی، گەرمیانی، هەولێری، سۆرانی، موکری، شارباژێری، پشدەری.

**٢- دوو شێوە لا تەنیشتەکە:**

أ) **کرمانجی خواروو:** فەیلی، کرماشانی، لەکی، کەڵهوری، خانەقینی و هەندێ لەو شێوە زارانە دەگرێتەوە کە بە شێوەی (لوڕی) دەدرێتە قەڵەم.

ب) کۆمەڵە شێوەی گۆرانی — زازایی

زازاکانی گۆران ئەو زازانەن کە لە هەورامان و ناوچەکانی زەنگەنە و ناوچەی کاکەی یەکان لە کەرکوك قسەی پێدەکەن و بە زمانی (ماچۆ) بەناوبانگە.

زازاکانیش لە ناوچەکانی بین گۆل و ناوچەکانی ئەلەزیز (دێرسیم) خەرپووت، مەعدن، ناوچەکانی دیاربەکر (قولب، هێنە، پیران، چێرمووك) و ئورفە (سیوێرەك) قسەی پێدەکەن[٢٨].

(سەید عەلی میرتیبیا) بیری (شەرەفنامە)ی لەمەر دابەشکردنی زارەکانی کوردی بەم شێوەیە شیکردووتەوە.

---

٢٨- جەمال نەبەز، زمانی یەکگرتووی کوردی، ١٩٧٦: ٢٢-٢٣.




دەڵێت لوڕ بریتییە لە شێوە زارەکانی (فەیلی، بەختیاری، حەفتگلی، سوینگەردی، خەڵکی دیزفوول، شاری کورد، چوار مەحەل، پشتکۆ، خورەم ئاباد، ئەلشتەر، ئەلیگۆدەرز) گفتوگۆی پێ دەکەن [٢٩].

نیعمەت عەلی سایە: زارەکانی زمانی کوردی بەم شێوەیە دەست نیشان دەکات [٣٠]:




محەمەد ئەمین هەورامی: بەسێ زار زمانی کوردی دەست نیشان دەکات:




زاری لوڕی ناوچەی لوڕستانی گەورە و بچووکی گرتەوە ، واتە ڕێگـای خەنـەقین کرماشـان لەسەرەویە ، لە خوارەوەشی بە درێژایی خاکی کوردستان درێژبووتەوە [٣١] ♣.

٢٩- سەید عەلی میرییا، خێڵ و تایفەکانی عەشایەری کوردی ئێران، ١٩٩٥: ١٢

٣٠- نیعمەت عەلی سایە، ڕێزمانی کوردی زاری کەڵهوڕی، ٢٠٠٤: ٥

٣١- محەمەد ئەمین هەورامی ، زاری زمانی کوردی لە تەرازووی بەراووردا ، ١٩٨١ : ٦٨

♣ بۆ زانیاری زیاتر ، بڕوانە هەمان سەرچاوە : ٦٨

فواد حەمە خورشید : زار و شێوە زارەکانی زمانی کوردی بەم شێوەیە دابەشکردووە[٣٢] :




لەو دابەشکردنە جوگرافیانەی شێوەزارەکانی زمانی کوردی ئەوەمان بۆ ئاشکرا بوو کە هەموو دابەشبوونەکان ئاماژە بۆ چەند ناوچەیەکی تارادەیەك دیاری کراو دەکەن کە بوونی (فەیلی)یەکان وەکو شێوە زارێکی زمانی کوردی لەو ناوچانە نیشتەجێ بوونە، بەلاّم ئەوەی بەلای ئێمەوە زیاتر جێگای سەرنج بێت ئەو دابەشکردنانەیە کە شێوەزاری فەیلی بە شێوە زارێکی کرمانجی خواروو دادەنێت، لە هەمان کاتدا لەگەڵ بۆچوونەکەی (فواد حەمە خورشید) ین لوڕستان دابەشی سەر لوڕی گەورە و لوڕی ڕەسەن (بچووك) دەکات [٣٣]. مەبەستی لە لوڕی بچووك (فەیلی)یەکانە بۆ دیارکردنی شوێنی نیشتەجێ بوونیان دەڵێت: هەموو

---

٣٢- فواد حەمە خورشید، ١٩٨٥ : ٥٨-٧١.

٣٣- (س.پ)، ١٩٨٥: ٦٤-٦٥.

هۆزەکـانی لوڕی بچووك واتە (هۆزەکـانی ناوچەی پشتی کۆه و پێش کۆه و بالاگریوە)لە ژێـر سایەی دەسەلاتی کوردی خۆیان بـوون بـەنازناوی فـەیلی دەناسـران ( General agnomen faille )، واتە دانیشتوانی نێوان کرماشان و رووبـاری دژدا دادەنیشن[٣٤].

دانیشتوانی زاری فەیلی لە سنووری عێراق ئێسـتا لـە ناوچـەکانی (بەغـدا - بەتایبـەتی گەرەکی باب ئەلشێخ، شۆریجە، شەقامی فەلەسـتین، کـوت، ناسـریە، رومـادی - بەتایبـەتی گەرەکی تەئمیم، (بەسرە [٣٥])، هەندێ هۆزی ناو و دەرەوەی خانەقین - بەتایبەتی گەرەکـەکانی ناو شار وەك مەڵك شاه و کاریزبان و خواروو ، هەروەها لە مەندەلی، جەسـان، چـلەی، کـانی خاسان، بەلەدروز، قۆرەتو، چەمچەقەڵ، تەفرەقە، شارنو، کێودی، پردێ) دا هەن.

هەروەها لە ناوچەکانی کەرکووك هەولێر و و سـلێمانی و دهـۆك و چـەند ناوچـەیەکی تـر نیشتەجێن [٣٦].

---

٣٤- فواد حەمە خورشید، ١٩٨٦: ٩٩ -١٠٠.

٣٥- چاوپێکەوتن: د.جەمال رەشید: (٢٠٠٨/٣/٢٥): شاری (بەسرە) فەیلیەکان بناغەیان دانا.

٣٦- ئێستا لە شاری کەرکووك ئەو رێژەیە بەرز بووتەوە بە چەندین هۆکاری جۆرا وجۆر .

# بەشی دووەم

## ٢- گرێ:

### ٢-١-١: پێناسەی گرێ:

گرێ: لە مۆرفیمێکی سەربەخۆ یان زیاتر پێك دێت. بەمەرجێك پەیوەندیـەکی سینتاکسـی بەهێز لە نێوانیادا هەبێت. وەك پێکهێنەرێکی گەیەنەر دەکەوێتە نێوان وشە و ڕستە، واتە لە ڕووی ڕۆنانەوە لە ڕستە بچووکترە و لە وشەش گەورەترە [٣٧].

### ٢-١-٢: تایبەتی یەکانی گرێ:

١- دەبێ لە گرێدا پەیوەندی هەبێت لە نێوان سەرە و دیارخەردا، واتە گرێ بە لایەنی کەمـەوە دەبێت سەرەیەکی تێدابێت.

٢- سەرە کرۆکی گرێیە، تەنانەت سەرە جۆری گرێیەکە دیاری دەکـات و جیـای دەکاتـەوە لـە جۆرەکانی تر، واتە بەهۆی سەرەوە جۆری گرێیەکە دەناسرێتەوە، ئەگەر سەرە ناو بوو ئـەوا بەگرێیەکە دەوترێت گرێی ناوی، ئەگەر سەرە ئاوەڵناو بوو ئەوا بەگرێیەکە دەوترێـت گرێـی ئاوەڵناوی، ئەگەر سەرە کار بوو ئەوا بەگرێیەکە دەوترێت گرێی کاری،...تاد.

٣- دەشێت گرێ جگە لەسەرە چەند کەرەستەیەکی تێدابێت، کـە دەبنـە کەرەسـتەی لاوەکـی گرێیەکە و پێیان دەوترێت دیارخەر.

٤- پەیوەندی نێوان سەرە و کەرستە لاوەکی یەکە پەیوەندیەکی دەسەڵاتدارییە، واتـە کەرسـتە لاوەکی یەکان لە ژێر دەسەڵاتی سەرەدان، لـە نـاو گرێـی ناوییەکـەدا سـەرە زاڵـە بەسـەر کەرستەکانی تردا.

٥- سەرە ئەو پێکهێنەرەی گرێیە، کە هەبوونی نەك دەرکەوتنی لە گرێدا پێویستە [٣٨].

٦- لە گرێدا دەتوانرێت کەرستە لاوەکی یەکان لابدرێت بەبێ ئەوەی کار لە ڕۆنان یان لە واتای گرێیەکە بکات، بەڵام سەرەی گرێ لانادرێت، ئەگەر لاش بدرێت ئەوا لە ڕۆنـانی ژێـرەوەدا بوونی دەمینێ [٣٩].

---

37- 1997 ،Fattah. M.M: 38

٣٨- دیار عەلی کەمال، ڕێزمانی کوردی ڕوانگەیەکی بەرهەمهێنان و گوێزانەوە، ٢٠٠٢: ٤٣

٣٩- قەیس کاکل تۆفیق، پەیوەندیەکانی نێودەق، ٢٠٠٢: ١٦٠

٧- گرێ سنووری دیاری کراوی نییە، دەتوانرێ بێ کۆتا فراوان بکرێت.

## ٢-٣-١: جۆرەکانی گرێ:

گرێی ناوی

گرێی کاری

گرێی ئاوڵناوی

گرێی بەند

## ٢-٤-١ گرێی ناوی:

ئەو بەشە سەرەکییەی ڕستەیە بەلای کەمەوە لە ناوێك یان جێناوێـك پێـك دێـت، یـان لـە کەرستەیەکی سەرەکی و کەرستیەك یـان چـەند کەرسـتەیەکی لاوەکـی (دیارخـەر) پێـك دێـت. دیارخەرەکانیش لەپێش سەرە یان لە دوای سەرە دەردەکـەون، دەشـێت دیارخـەرەکان بەیارمـەتی مۆرفیمی خستنەسەر یان بە بێ مۆرفیمی خستنەسەربە سەرەی گرێ ناویەکەوە بلکێن، جگە لـە ناو بەشەکانی تری ئاخاوتنی وەکو (جێناو، چاوگ) دەتوانن ئەرکی سەرەی گرێی ناوی ببینن.

## ٢-٤-٢: ڕۆنانی گرێی ناوی:

لە (ش. ز. ف) دا وەك هەموو زار و شێوە زارەکانی تر سادەترین گرێی نـاوی بـەپێی ئـەم یاسایە درووست دەبێت.

گ٠ن ⟸ ( ناو / جێناو )

وەك:

راوێژ خەفت. — راوێژ نووست.

ئاوات هات. — ئاوات هات.

مانگا مرد. — مانگا مرد.

| | |
|---|---|
| کەموتەر باڵگرد. | کۆتر فری. |
| ئەو هات. | ئەو هات. |
| ئوان هاتن. | ئەوان هاتن. |
| ئیوە خەفتن. | ئێوە نووستن |




**٢-٤-٣: فراوانکردنی گرێی ناوی:**

گرێی ناوی لە رووی فراوانکردنەوە ڕۆنانێکی بێ سنوورە، چونکە هەتا لە توانای ئاخێوەرانی (ش. ز. ف) ەکەدا بێت دەتوانن گرێی ناوی فراوان بکەن، هەر فراوان کردنێکیش لە گرێیەکە رووبدات پشت بە دریارخەرەکان دەبەستێت، جا دیارخەرێك بێت یان زیاتر، ناو یان(جێناو، چاوگ) دەبێتە سەرەی گرێیەکە دیارخەرەکانیش، کە بەشداردەبن لە فراوانکردنی گرێکەدا دەتوانن لە پێش سەرە و لە دوای سەرە دەربکەون.

لە ڕۆنانی گرێی ناویدا دیارخەرەکان دەتوانن بە سێ شێوە دەرکەون و سادەترین گرێی ناوی فراوان بکەن:

١- دیارخەرەکانی پێش سەرە.

٢- دیارخەرەکانی دوا (پاش) ی سەرە.

٣- دیارخەرەکانی پێش و دوا (لای ڕاست و چەپ) ی سەرە.

### ٢-٤-٤: ١- دیارخەرەکانی پێش سەرە:

سادەترین گرێی ناوی دەتوانێت دیارخەرەکانی پێش سەرە وەرگرێت، دیارخەرەکانی پێش سەرە ڕاستەوخۆ بەبێ هیچ مۆرفیمێك یان وشەیەکی زیادە بەسەرەکەوە دەلکێت و دەبێتە دیارخەری پێشەوە بۆ سەرەی گرێ ناویەکە، واتە ئەو کەرستە مۆرفۆلۆژیانەی کە لە پێش سەرەی گرێی ناوی دەردەکەون ئەمانەن:

**١- جێناوی نیشانە:**

جێناوی نیشانە دەتوانێت لە فراوان کردنی گرێی ناوی بەشداری بکات و ببێتە دیارخەری پێش سەرەی گرێ ناویەکە.

جێناوی نیشانە لەم (ش. ز)ە بە پێی تاك و کۆ و دوورو نزیك دەگۆڕێت.

وەك:

| | |
|---|---|
| ١- ئەی | بۆ کەس و شتی تاکی نزیك : |
| ئەی کوڕە خاسە. | ئەم کوڕە باشە. |
| ئەی ژنە هات. | ئەم ژنە هات. |
| ٢ - ئەو : | بۆ کەس و شتی تاکی دوور: |
| ئەو کەموترە باڵ گرت. | ئەو کۆترە فری. |
| ئەو ژنە هات. | ئەو ژنە هات. |
| ئەیانە: | بۆ کەس و شتی کۆی نزیك : |
| ئەی کوردانە. | ئەم کوردانە. |
| ئەی ژنانە. | ئەم ژنانە. |
| ئەی قەڵەمانە. | ئەم قەڵەمانە. |
| بۆ کەس و شتی کۆی دوور: | |
| ئەوانە قەومن. | ئەوانە خزمن. |
| ئەوکوڕەیلە زەرنگن. | ئەو کوڕانە زیرەکن. |

دەتوانین ئەم یاسایەی بۆ دابڕێژین:

گ٠ن ⟸ جێناوی نیشانە + ناو

وەك:

ئەی کوڕە خاسە.ئەم کوڕە باشە.

ئەو کەموترە باڵ گرت. ئەو کۆترە فری.

ئەی ژنانە هاتن ئەم ژنان هاتن.

ئەوانە قەومن. ئەوانە خزمن.

**ئەی ژنە هات**




هەندێك جار سەرەی گرێیە ناویەکە دەرە ناکەوێت.

وەك.

ئەیە هات.

ئەیانە هاتن.

ئەوە هات.

ئەوانە هاتن.

ئەیە قەڵەمە.

ئەیە قەڵەمە




## ٢- ڕادە[٤٠]:

یەكێك لـە دیارخـەرەكانی پـێش سـەرە بریتییـە لـە (ڕادە) ئـەویش كەرسـتەی وەك (كەمێگ، كەمێ، فرە... تاد) دەگرێتەوە[٤١].

دەتوانین ئەم یاسایەی بۆ دابڕێژین:

گ٠ن ⇐ ڕادە + ناو

وەك:

| | |
|---|---|
| كەمێ پویل ها لەماڵ. | كەمێ پارە لەماڵە. |
| بڕێ ژن ژانە. | هەندێ ژن ژانە. |
| بڕێ دار سوزیا. | هەندێ دار سوتا. |
| گشت كوڕ هاتن. | گشت كوڕ هاتن ؟؟(گشت كورەكان هاتن.) |
| گشت مناڵ خەنین. | گشت منداڵ پێكەنین ؟؟(گشت منداڵەكان پێكەنین.) |

---

٤٠- بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی (ڕادە) بروانە ئەم سەرچاوانە:

أ - د.قەیس كاكل تۆفیق، ردە لە گرێی ناویدا ، ٢٠٠٣: ١٨-٣٣

ب - د.یوسف شریف، ڕادە و هەنێ تێبینی دەربارەی ڕادە، ١٩٩٩: ١١٤-١٣٢

٤١- لە (ش. ز. ف) دا هەندێك جار لە بری (ێگ) مۆرفیمی (یگ) بەكاردێت.

| | |
|---|---|
| فره سیڤ خوریا. | زۆر سێو خورا. |
| فره خەلیا سوزیا. | زۆردەغڵ سوتا. |

ئەو وشانەی که (رادە) دەردەخەن دەتوانن بە سێ شێوەی جیا بیان خەینەروو:

١ - وشەکانی (گشت) وەك مۆرفیمێکی سەربەخۆ دەچنە پێش گرێی ناوی.

وەك:

| | |
|---|---|
| گشت کوڕهاتن. | گشت کوڕهاتن ؟؟(گشت کورەکان هاتن.) |

٢- له شێوەی وشەکانی (فره، کەمێگ، کەمیَ، بریَ، حەمکە،...تاد) بەکاردێن.

وەك:

| | |
|---|---|
| کەمێگ شیر ڕژیا. | کەمێك شیر ڕژا. |
| کەمیَ پویل ها لەماڵ. | کەمیَ پاره لەماڵە. |
| بڕیَ دار سوزیا. | هەندیَ دار سووتا. |
| فره سیڤ خوریا. | زۆر سێو خورا. |

٣ - جگه لەم وشانه هەموو ئەو ناوانەی که دەشیَ وەك یەکەیەکی پێوانه بەکاربهێنرێن ئەوا بەیارمەتی ئامرازی (ێگ) یان (یگ)، یاخود (یَ) هەندێك جار مۆرفیمی(یَ) به (ی) گۆدەکرێت[٤٢].

وەك:

| | |
|---|---|
| باوشێگ گوڵ. | باوشێك گوڵ. |
| کویزیَ شامی. | کوزیَ شووتی. |

---

٤٢- (کریم زەند) له ل (١٤)، زمانی کوردی و هونەری وەرگێران دەڵێت: (یَ) له شێوه زاری لوریدا نیه. ئەگەر مەبەستی نوسەر له لوڕ، لوری بچووك بێت ئەوا ئەو دەنگه ئەمرۆ هەیه، بەڵام هەموو دەنگێکی (یَ) له (ش. ز. ف)ی به بەراود لەگەڵ (ك. خ) سوك گۆدەکرێت، تەنانەت دەش گۆڕێت بۆ (ی) وەکو له سەرەوه روون کراوەتەوە.

کەمێگ شیر ڕژیا.                                        فرە خەلیا سوزیا.







**٣- وشەی (هەر):**

ئەم وشەیە لە پێشەوە دەبێتە دیارخەری (سەرە).

دەتوانین ئەم یاسایەی بۆ دابڕێژین:

گ٠ن ⟸ هەر + ناو

وەك:

| | |
|---|---|
| هەر راوێژ هات. | هەر راوێژ هات. |
| هەر ژن رەنگینە. | هەر ژن جوانە. |

دەبێت تێبینی ئەوە بکەین وشەی (هەر) ئەگەر لە پێش کار هات ئەوا نابێتە دیارخەر تەنها لەو بارانەدا نەبێت کە لەپێش ناودا دێن و ئەرکی دیارخەر دەبەخشێت .

وەك:

وشەی (هەر) فرەواتایە و چەند واتایەك دەبەخشێت

وەك:

| | | |
|---|---|---|
| هەر = تەنیا | هەر ئاوات هات. | هەر ئاوات هات. |
| هەر = وە تەنیا | هەر ئاوات ها لەشار. | هەر ئاوات لە شارە. |
| هەر = بەردەوامی | هەر کارکەی؟ | هەر ئیش دەکەیت. |

هەر راوێژ هات




**٤- وشەی (تەنیا):**

وشەی (تەنیا) دەبێتە دیارخەری پێشەوەی گرێی ناوی کاتێك لەپێش سەروە دێت. ئەم وشەیەش ئەرکی جیاکردنەوە دەبینێت لە ناو کۆمەڵێکدا.

دەتوانین ئەم یاسایەی بۆ دابڕێژین:

گ٠ن ⇐ تەنیا + ناو

وەك:

| | |
|---|---|
| تەنیا کوڕ هات. | تەنها کوڕ هات. |
| تەنیا ژن ڕەنگینن. | تەنها ژن جوانن. |
| تەنیا ئەنار خوەشە. | تەنها هەنار خۆشە |

تەنیا ئەنار خوەشە




### ٥- ئامرازی پرس:

ئامرازی پرس دەتوانێت لە فراوان کردنی گرێی ناوی بەشداری بکات و دەبێتە دیارخەری پێش سەرەی گرێ ناویەکە.

دەتوانین ئەم یاسایەی بۆ دابڕێژین :

گ٠ن ⇐ ئامرازی پرس + ناو

وەك:

کام شار خوەشە؟ کام شار خۆشە؟

چەن خەرویز ها لە ماڵ؟ چەند کاڵەگ لە ماڵە؟

کام نامە رەسیە پید؟ کام نامە پێت گەیشت؟

دەبێت تێبینی ئەوە بکەین هەموو ئامرازەکانی پرس لە (ش. ز. ف)دا ئەم ئەرکە نابینن، تەنیا ئەوانەی پرسیاریان لە دیارخەرەکانی گرێی ناوی پێ دەکرێت دەتوانن لە پێشەوە گرێی ناوی فراوان بکەن کە بریتین لە (کام / کامە، چەن).

ئامرازی پرسی (کام / کامە)پرسیاری لـە دیارخـەرەکانی دواوە پـیٚ دەکریٚـت  و لـە دواوە دەچیٚتە سەر (سەرە)، بەڵام کە بە ئامرازی پرسی (کام / کامە) پرسیاردەکریٚت ئەوا شویٚنەکەی دەچیٚتە پیٚشەوە.

وەك:

| | |
|---|---|
| ئەناری  خوەش. | هەناری خۆش. |
| کام ئەنار؟ | کام هەنار؟ |
| منالٚی خاس. | منداڵی باش. |
| کام منالٚ؟ | کام منداڵ؟ |

دەبینـیین وشـەی (کـام) پرسـیاری پـیٚ لـە ئاوڵنـاو کـراوە، بـەڵام لەشـویٚنی ئاوڵناوەکـە بەکارنەهاتووە. وەك :

منالٚی کام...؟    بەڵکو خۆی خزاندۆتە پیٚشەوە.

کام منالٚ؟

کام شار خوەشە؟



٦- جێناوی نەفی:

دەبێتە دیار خەری پیش سەرە کاتێك لە پێش سەرە دەردەکەوێت بەم دەرکەوتنەی گرێیەکە فراوان دەکات.

مۆرفیمی (هویچ) کە بۆ نەرێ بەکاردێت و هەمان خاسـێتی رادەی هەیـە، بـەڵام لـەرووی ڕۆنان و پێکهاتەوە جیایە لەگەڵ رادە، لەرووی واتاوە چەمکی رادەکە ناهێڵێ.

دەتوانین ئەم یاسایەی بۆ دابڕێژین:

گ٠ن ⟸ جێناوی نەفی + ناو

وەك:

| | |
|---|---|
| هویچ منالٚ نەخەفت. | هیچ منداڵ نەنووست. |
| هویچ ژن هات؟ | هیچ ژن هات؟ |
| هویچ ژن نەهات. | هیچ ژن نە هات |

هویچ ژن نەهات.



٧ - ژمارە:

ژمارە وەك دیارخەرێكی بەرچاو لە (ش، ز، ف) دەردەكەوێت بە پێی دەركـەوتنی لەگـەڵ سەرەدا جۆری دیارخەرەكە دەگۆڕێت، واتە لەپێش سەرە و لەدوای سەرە دەردەكەوێت ژمـارە بەشداری دەكات لە فراوان كردنی گرێی ناوی، هەر كاتێك بكەوێتە پێش سـەرەی گرێـی نـاوی ئەوە دەبێتە دیارخەری پێش سەرە.

دەتوانینن ئەم یاسایەیەی بۆ دابڕێژین:

گ٠ن ⇐ ژمارە + ناو

وەك:

| | |
|---|---|
| سیٚ كوچگ نانە بان گاوە. | سیٚ بەردیان خستە سەر گا. |
| هەزار زوان ها لە دەمی. | هەزار زمان لە دەمێتی ؟؟ |
| | (هەزار زمان وا لە دەمێتی ) |
| سەد و یەك كونا ها لە جەرگی | سەت و یەك كون لە جەرگێتی ؟؟ |
| | (سەت و یەك كون لە جەرگیدایە ) |
| هەفتا شامی خوریا. | حەفتا شووتی خورا. |
| چوارم كوڕ كەفت . | چوارەم كوڕ كەوت. |
| دو لە سێی زەویەگە فروشتمان. | دوو لە سەرسێی زەویەكەمان فرۆشت. |

هەزار زوان ها لە دەمی



دەتوانیین ژمارە بە سێ جۆر دیاری بکەین:

١ - ژمارەی بنجی

٢ - ژمارەی پلەی

٣- ژمارەی کەرتی

**١ - ژمارەی بنجی:**

ئەم جۆرە ژمارەیە ژمارەی دیاری کراو لە شتی هاورەگەزدا نیشان دەدات [٤٣].

وەك:

| | |
|---|---|
| دو کوڕ خەفتن. | دوو کوڕنووستن. |
| چوار ژن کەفتن. | چوار ژن کەوتن. |
| دییە شامی خوریا. | دە شووتی خورا. |

لەرووی ڕۆنانەوە دەشێ لەم زارەدا ژمارە بۆ سێ جۆر دابەش بکەین:

١- ژمارەی سادە: هەموو ئەوژمارانە دەگرێتەوە تەنها لە وشەیەکی بنچینەیی پێك دێن.

وەك:

| | |
|---|---|
| دو کوڕ خەفتن. | دوو کوڕنووستن. |
| دییە شامی خوریا. | دە شووتی خورا. |
| بیس منالٚ هاتن. | بیست مندالٚ هاتن. |
| شەس ژن نە هاتن. | شەش ژن نە هاتن. |

٢- ژمارەی ناسادە: دووجۆر دەگرێتەوە:

أ- دارژاو: لە ژمارەیەکی سادە و زیادەیەك پێك دێت.

وەك:

| | |
|---|---|
| پەنجا ژن هات. | پەنجا ژن هات. |
| هەفتا شامی خوریا. | حەفتا شووتی خورا. |

---

٤٣- د. ئەورەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی کوردی، ١٩٩٨: ٦٢

ب - لێکدراو: له دووژمارەی ساده پێك دێت.

وەك:

| | |
|---|---|
| هەڤده کوڕ هات. | حەڤده کوڕ هات. |
| نوزده شامی خوریا. | نۆزده شووتی خورا. |

٣- پێکەوەبەستراو: ((لەیەك کـەوتنی چـەند ژمارەیـەك پێکـدێت، کـه بەیاریـدەی (و)ی پێوەندی پێکەوه دەبەسترێن))[٤٤].

وەك:

| | |
|---|---|
| بیس و دو ژن هات. | بیست و دوو ژن هات. |
| چل و پەنچ کوڕ کەفت . | چل و پێنج کوڕ کەوت . |
| هەفتاو هەفت شامی خوریا. | حەفتاوحەوت شووتی خورا. |

## ٢- ژمارەی پلەیی:

ئەو ژمارانه دەگرێتەوه، که له ژماردندا ریزی هاورەگەز دەگەیەنن[٤٥]. ♣

وەك:

| | |
|---|---|
| هەفتم شامی خوریا. | حەوتەم شووتی خورا. |
| چوارم کوڕ کەفت. | چوارەم کوڕ کەوت. |
| دییەم ژن هات. | دەیەم ژن هات. |
| دومین کوڕ کەفت . | دووەمین کوڕ کەوت. |
| هەشتمین  شامی خوریا. | هەشتەمین شووتی خورا. |
| پەنجا و پەنجمین ژن هات. | پەنجا و پێنجەمین ژن هات. |

---

٤٤- (س. پ): ٨٧-٨٨

٤٥- (س. پ): ٨٨

♣ - له (ش. ف) دا، که ژمارەی دارێژراو یان لێکدراو له ژمارەی ساده درووست دەکرێت، ئەو ژماره سادانەی به دەنگی (کۆنسنانت) کۆتاییان دێت، لەکاتی لێکدان لەگەڵ زیادەکه، که به دەنگی (کۆنسنانت) دەست پێدەکات ئەوا دەنگی (ڤاوڵ)  وەرناگرێت، ئەگەر وەرش بگرێت ڕاستەوخۆ لەگۆکردندا دەکرتێت.

### ٣- ژمارەی کەرتی:
(ژمارەی کەرتی ئەندازەی کەرت رادەگەیەنێ) [٤٦].
ئەم جۆرە ژمارەیە هەمان چەمکی رادەی هەیە.
وەك:

| | |
|---|---|
| دو لە سێی زەویەگە فروشتمان. | دوو لە سەر سێی زەویەکەمان فرۆشت. |
| یەك لە پەنجی مییەگان مردن. | یەك لە سەر پێنجی مەرەکان مردن. |
| دو لە چواری کوڕەگان قەومن. | دوولە سەر  چواری کوڕکان خزمن. |

لە (ش.  ز.  ف) دا لـە بـری  ناوهێنـانی کەرتـەکان وەکـو (دو لـە سـێی، یـەك لـە پەنج،...تاد)
زیاتر وشەی (کوت) بەکاردێت.
وەك:

| | |
|---|---|
| دو کوتی زەویەگە فروشتمان. | دوو بەشی زەویەکەمان فرۆشت. |
| چوار کوتی کوڕەگان قەومن. | چوار بەشی کوڕەکان خزمن. |

جێگای سەرنجە ئەگەر زانیاری لەنێوان قسەکەر و بیسەر و دەوروبەر هەبێت یـان نـەبێت دەربارەی رووبەری زەویەکە، یان ژمارەی کوڕەکان، ئەوا وشەی (کوت) هەربـەکاردێت، دەشـێ لەکاتی گفتوگۆ زانیاریەکان بخرێتەروو.

٨- گرێی ئاوڵناوی پلەی بالاّ:
گرێی ناوی سادە فراوان دەکرێت بە ئاوەڵناوی پلەی بالاّ کاتێك کە دەکەوێتە پێش سـەرەی گرێی ناویەکە، لەم (ش. ز)ەدا تەنها ئاوەڵناو لە پلەی بالاّ دەتوانێت ببێت بە دیارخەری پێش سەرەی گرێی ناوی.
دەتوانین ئەم یاسایەی بۆ دابڕێژین
گ٠ن ⟸ گ.ئاو پلەی بالاّ + ناو

٤٦- (س. پ): ١٠١.

وەك:

خاسترین قەڵەم شکیا.	باشترین قەڵەم شکا.

گەپترین شامی خوریا.	گەورەترین شووتی خورا.

درێژترین دار بوەر.	درێژترین دار ببرە.

گەپترین شامی خوریا




**٩- بریناو:**

لــە (ش. ز. ف) دا بریناو وەك دیارخــەرێکی چالاك لــە پــێش ســەرەی گرێــی نــاوی دەردەکەوێت و ئەرکی فراوان کردنی گرێیەکە دەبینێت، واتە دەبێتە دیارخــەری پــێش ســەرەی گرێ ناوییەکە، ئەم بریناوانەش بەپیێ دەسەڵاتی (ئـاینی، سیاسـی، خزمایـیـەتی، پیشـەیی) دابەش کراون[٤٧]. بری ناو لە پێشەوە سەرەی گرێی ناوی فـراوان دەکـات. ئـەو دیارخەرانـەی دەکەونە پێش سەرەی گرێی ناوی پێیان دەڵێن (بریناو)، ئەوانەی دەکەونە دوای ســەرەی گرێــی ناوی پێیان دەڵێن (لەقەب)[٤٨] *.

---

٤٧- ئاواز حەمە صدیق، ریزبوونی کەرستە لە زمانی کوردی دا، ١٩٩٦: ٣٢-٣٤

٤٨- د. محەمەد فاروق صدیق، دەستوری پێوەلکانی مرۆڤناو ((بەناوی باوك و باپیر و لە قەبەوە لە زمانی کوردی وچەند زمانێکی تردا))، ١٩٩٠: ٢١

کەواتە، دەتوانینن ئەم یاسایەیی بۆ دابڕێژین :

گ٠ن ⇐ بریناو + ناو

وەك:

مامۆستا چاوان هات.     ماموسا چاوان هات.

حاجی راوێژ لە سەر دارەکە دابەزی.     هەجی راوێژ لە بان دارەگە داوەزی.

کوێخا حەسەن لەشارە.     کوخا هەسەن ها لە شار.

دەبێت تێبینی ئەوە بکەین هەموو ئەو ڕستانەی سەرەوە لەلای قسەکەر وبیسەر و دەوروبەر لەرووی واتاوە دەبێت روون و ئاشکرابن، بە واتایەکی تر کە دەڵێین (ماموسا چاوان، حاجی راوێژ کوخا هەسەن) دەبێت زانیاری و شارەزایی لای دەوروبەر هەبێت کە هەریەك لە ناوەکانی (ماموسا، هەجی، کوخا ) ناوی (پیشە و دەسەڵاتی ئاینی و کۆمەڵایەتی...تاد) ین خوازراون بۆ هەریەك لە ناوەکانی (چاوان، راوێژ، هەسەن) بەم خواستنە هەریەك لە ناوەکانی (ماموسا، هەجی، کوخا ) دەبنە دیارخەری پێشەوە بۆ سەرەی گرێ ناوییەکانیان کەبریتین لە (چاوان، راوێژ، هەسەن).

وەك:

ماموسا چاوان هات.

کوخا هەسەن ها لە شار.

کوخا هەسەن ها لە شار




* بەبروای ئێمە هەموو دیارخەرێکی پێش سەرەی گرێی ناوی نابێتە بریناو تەنها ئەو ناوانە نەبێت، کە لە بری ناوێك خوازراون، بۆزیاتر زانیاری بروانە: دیارخەرەکانی پێش گرێکان ژمارە (١ – ٨).

ئەگەر لەگرێیەکی لەو جۆرە ئەو تێبینیەیی سەرەوەمان بەدی نەکرد ئەوا گرێیەکە دوو سەرەی دەبێت و ناتوانیین بلێین کامیان لەژێر دەسەلاتی ئەوەی تریان دایە.

هەندێك جار سەرەی گرێ ناویەکە خۆی لە خۆیدا ناوێکی لێکدراوە کەدێتە ناو ڕستەوە بەسانایی دیارخەری پێشەوە وەردەگرێت و دەبێتە سەرەی گرێ ناویەکە، بەلام بوونی دوو سەرەیی لە سەرەی گرێیەکەدا هەردەمینێت .

وەك:

مەلا حەمە لاو هات.

لەم ڕستەیە (مەلا) دیارخەری سەرەی (حەمە لاو) ە و گرێی ناویەکەی فراوان کردووە.



هەموو ئەو دیارخەرانەی پێشەوەی گرێی ناوی کە لە سەرەوە باسمان کردن دەتوانیین لە یاساییەکدا کۆیان بکەینەوە.

گ٠ن ⇐

جێناوی نیشانە
رادە
هەر
تەنیا
ئامرازی پرس
جێناوی نەفی
ژمارە
ئاوڵناوی پلەی باڵا
بریناو

+ ناو / جێناو

لەم (ش. ز)ەدا زیاتر لە دیارخەرێك دەتوانن لە پێش سەرەکەوە دەرکەون بەبێ هیچ مۆرفیمێکی خستنەسەر.

وەك:

| | |
|---|---|
| ئەو گوڵە ئەو گوڵە | |
| ئەو دو گوڵە | ئەو دوو گوڵە |
| تەنیا ئەو دو گوڵە تەنها | ئەو دوو گوڵە |
| هەر تەنیا ئەو رەنگینترین گوڵە. | هەر تەنها ئەو جوانترین گوڵە. |
| هەر تەنیا چەن گوڵێگ هاتن. | هەر تەنها چەند گوڵێك هاتن. |
| تەنیا ماموسا شنە هات. | تەنها مامۆستا شنە هات. |
| هەرتەنیا ماموسا شنە هات. | هەرتەنها مامۆستا شنە هات. |
| هەر هویچ کوڕ نەهات. | هەر هیچ کوڕ نەهات. |
| هەر هویچ ماموسا شنە نەهات؟ | هەر هیچ مامۆستا شنە نەهات؟ |

هەر تەنیا ئەو دو گوڵە هاتن.




دیارخەرەکانی پێش سەرەی گرێی ناوی لەم (ش. ز)ەدا ناتوانن لە (چوار) دیارخەر زیاتر بە دوای یەکتردا بێن، لەوە زیاتر زۆرکردنە لە دیارخەرەکانی پێش سەرەی گرێی ناوی، چونکە ڕستەی نارێزمانی درووست دەکات.

وەك:

هەرتەنیا ئەو دو گوڵە هاتن. — هەرتەنها ئەو دوو گوڵە هاتن.

هەر تەنیا ئەو دو کوڕەهاتن. — هەر تەنها ئەو دوو کوڕە هاتن.

هەر تەنیا ئەو دو کوڕەیلە هاوردنەی. — هەر تەنها ئەو دوو کوڕانەی هێنا.

تەنیا هەر ئەو دو کوڕەیلە هاوردەی. — تەنها هەر ئەو دوو کوڕانەی هێنا.

هەر تەنیا ئەو دو هویچ کوڕەیلە هاوردنەی * هەر تەنیا ئەو دوو هیچ کوڕانەی هێنا. *

هەر تەنیا هویچ ئەو دو کوڕەیلە هاوردنەی. * هەر تەنیا هیچ ئەو دوو کوڕانەی هێنا. *

دیارخەرەکانی پێش سەرەی گرێی ناوی لەناو خۆیاندا تاڕادەیەك سنووری ریزبەندی پێش سەرە دەپارێزن، واتە جێ گۆرکێ لە نێوان دیارخەرەکان بە پێی یاسای ڕستەسازی (ش. ز)ە کە دەبێت، چونکە هەندێك دیارخەر لەگەڵ هەندێکی تر ناتوانن جێ گۆڕکێ بکەن، بەڵکو شوێنیان

بە پێی سنووری ریزبەندی هاتنی دیارخەرەکان دیاریکراوە، لە هەمان گرێدا هەندێ دیارخەر لەگەڵ هەندێکی تر هەرگیز لەگرێیەکدا بەیەکەوە دەرناکەون، ئەگەر دەرکەون ڕستەی ناڕێزمانی درووست دەکات.

وەك:

| | |
|---|---|
| ئەو گوڵە | ئەو گوڵە |
| ئەو دو گوڵە. | ئەو دوو گوڵە. |
| دو ئەو گوڵە❊ | دوو ئەو گوڵە ❊ |
| هەرئەو دو گوڵە. | هەرئەو دوو گوڵە. |
| دو ئەو هەر گوڵە❊ | دوو ئەو هەر گوڵە ❊ |
| ئەو دو هەر گوڵە❊ | ئەو دوو هەر گوڵە❊ |
| تەنیا هەر ئەو دو گوڵە. | تەنها هەر ئەو دوو گوڵە. |
| هەر تەنیا ئەو دو گوڵە. | هەر تەنها ئەو دوو گوڵە. |
| تەنیا دو ئەو هەر گوڵە❊ | تەنها دوو ئەو هەر گوڵە ❊ |
| هەر تەنیا ئەو رەگینترین گوڵە. | هەر تەنها ئەو جوانترین گوڵە. |
| هەر ئەو تەنیا رەنگینترین گوڵە | هەر ئەو تەنها جوانتین گوڵە. |
| رەنگینترین ئەو هەر تەنیا گوڵە❊ | جوانترین ئەو هەر تەنها گوڵە ❊ |
| هەر ئەو رەنگینترین تەنیا گوڵە ❊ | هەر ئەو جوانترین تەنها گوڵە ❊ |
| هەر تەنیا ئەو چەن گوڵە هاتن. | هەر تەنها ئەو چەند گوڵە هاتن. |
| تەنیا هەر ئەو چەن گوڵە هاتن. | تەنها هەر ئەو چەند گوڵە هاتن. |
| ئەو هەر چەن تەنیا گوڵە هاتن❊ | ئەو هەر چەند تەنها گوڵە هاتن ❊ |
| چەن هەر تەنیا گوڵە هاتن❊ | چەند هەر تەنها گوڵە هاتن ❊ |
| چەن هەر تەنیا ئەو گوڵە هاتن❊ | چەند هەر تەنها ئەو گوڵە هاتن ❊ |
| ئەو هویچ گوڵ نەفروش ❊ | ئەو هیچ گوڵی نەفرۆشت ❊ |
| هویچ ئەو گوڵ نەفروش. | هیچ ئەو گوڵی نەفرۆشت. |
| هەرتەنیا ئەو هویچ گوڵ نەفروش. | هەرتەنها ئەو هیچ گوڵی نەفرۆشت. |
| هویچ تەنیا ئەو هەر گوڵ نەفروش. | هیچ تەنها ئەو هەر گوڵی نەفرۆشت. |
| ئەو تەنیا گوڵ نەفروش. | ئەو تەنها گوڵی نەفرۆشت. |

| | |
|---|---|
| تەنیا ئەو گوڵ نەفروش. | تەنها ئەو گوڵی نەفرۆشت. |
| هەر تەنیا ئەو دو کوڕەیلە هاوردنەی. | هەر تەنها ئەو دوو کوڕەی هێنا. |
| هەر هویچ ئەو دو تەنیا کوڕەیلە هاوردنەی * | هەر هیچ ئەو دوو تەنها کوڕەی هێنا * |

لە دیارخەرەکانی پێشەوەی سەرەی گرێی ناوی ئە م خاڵانە تێبینی دەکەین:

١- ئەگەر(چوار) دیارخەر لە پێش سەرەی گرێی ناوی بێت ئەوا (هەر، تەنیا) دەبنە دیارخەری هەرە کۆتایی دیارخەرەکانی دوای خۆیان، واتە لە هەموو دیارخەرەکانی تردوورتر دەکەونەوە لە سەرە.

٢- دیارخەری (ژمارە) راستەوخۆ دەکەوێتە پێش سەرەی گرێی ناویی و ڕێگا بە هیچ دیارخەرێکی تر نادات بکەوێتە نێوانیان، واتە هەرچی دیارخەری تر هەیە دەکەونە پێش (ژمارە) و دەبنە دیارخەر بۆی.

### ٢-٤-٥: ٢- دیارخەرەکانی دوای سەرە:

سادەترین گرێی ناوی فراوان دەکرێت بە یارمەتی دیارخەرەکانی دوای سەرە ئەم دیارخەرانەش چ ڕاستەوخۆ بەبێ هیچ مۆرفیمێکی خستنەسەر یان ناڕاستەوخۆ بە یارمەتی مۆرفیمی خستنە سەر بە سەرەی گرێیەکەوە دەلکێن و دەبنە دیارخەری دوای سەرەی گرێی ناوییەکە، کەواتە دەتوانین دوو کۆمەڵە دیارخەری دوای سەرە دیاربکەین:

١- دیارخەرەکانی دوای سەرە بەبێ مۆرفیمی خستنەسەر.
٢- دیارخەرەکانی دوای سەرە بەیارمەتی مۆرفیمی خستنەسەر.

### ١- دیارخەرەکانی دوای سەرە بەبێ مۆرفیمی خستنە سەر:

ئەم دیارخەرانە راستەوخۆ بەسەرەوە دەلکێن و گرێیەکە فراوان دەکەن و دەبنە دیارخەری دوای سەرەی گرێ ناوییەکە، دیارخەرەکانیش بریتین لە مۆرفیمی (ناسراو و نەناسراو)ی تاك و کۆ، جێناوی خاوەنیەتی.

بەم شێوانەی لای خوارەوە:
١- مۆرفیمی (ناسراو و نەناسراو)ی تاك و كۆ بەم شێوانە دەبنە دیارخەری دوای سەرە:

١ - مۆرفیمی ناسراو ی (ەگە)، كە چەند ئەلۆمۆرفییێكی تری هەیە بریتین لە (گە، ە). مۆرفیمی (گە) هەمان مۆرفیمی (ەگە) یە تەنها دەنگی (ە) كرتاوە بۆ سووك كردنی گۆكردن مۆرفیمی (ە) هەر مۆرفیمی (ەگە) یە.(گە) ەكەی كرتاوە و بووە بە (ە) بۆیە لە گۆكردندا بڕگەی دووەم درێژ دەكرێتەوە بە ئەندازەی درێژی (ەگە) كە [٤٩].

ئەم مۆرفیمانە (ەگە، گە، ە) دەچنە سەر گرێی ناوی و گرێیەكە لە دواوە فراوان دەكەن و دەبنە دیارخەر بۆ سەرەی گرێیەكە دەركەوتنیان لە دوای سەرەی گرێی ناوی بەم شێوانەی لای خوارەوە دەبێت:

وەك:

| | |
|---|---|
| ١- منالّەگە هات. | مندالّەكە هات. |
| ژنەگە سوزیا. | ژنەكە سووتا. |
| كەموتەرەگە بالّ گرد. | كۆترەكە فڕی. |
| ٢- داناگە هات. | داناكە هات. |
| مانگاگە لە وەریا. | مانگاكە لە وەڕا. |
| گیاگە خوڕیا. | گیاكە خورا. |
| قسێگە خاسە. | قسەكە باشە. |
| ٣ - ژنە هات. | ژنە هات. |
| بزنە مرد. | بزنە مرد |

---

٤٩- نیعمەت عەلی سایە، ٢٠٠٤: ١٦

کەواتە دەتوانین ئەم یاسایەی بۆ دابڕێژین:







لە هەندێ گرێ (ی) نیمچە ڤاوڵ دەکەوێتە نێوان کۆتا دەنگی ناوەکە و مۆرفیمی(ەگە)ی ناسراوی ئەم هاتنە ناوەوەیە بۆ ئەوەیە هێشووە ڤاوڵ درووست نەبێت.

وەك:

**ماسییەگە خوریا.**

مۆڕفمی ناسراوی لە ڕووی ڕێزمانـەوە لەگـەڵ هـەردوو جـۆری نـاو (گشـتی و تایبـەتی) بەکاردێت بە شێوەیەکی گشتی زیاتر لەگەڵ ناوی گشتیدا بەکاردێت وەکو ناوەکـانی سـەرەوە،

هەرچەندە لە هەندێ چوارچێوەی قسەکردندا بۆ نـاوی تایبـەتیش بـەکاردێت، بـەڵام ئـەم بـارە دەگمەنە، چونکە ناوی تایبەتی خۆی لە خۆیدا چەمکی ناسراوی تێدایە

وەك:

شنەگە هات.   شنەکە هات.

ئاواتەگە  خەفت.ئاواتەکە  نووست.

شنەگە هات




٢ - مۆرفیمی نەناسراوی (ێگ)  و ئەلۆمۆرفەکەی (ێ):

لەم (ش. ز)دا مۆرفیمی نەناسراوی بەشداری لە فـراوان کردنـی گرێـی نـاوی دەکـات وەك دیارخەرێکی دواوەی سەرەی گرێی ناوی.

دەتوانین ئەم یاسایەی بۆ دابرێژین:

گ.ن ⟸ ناو  +  (ێگ، ێ)

وەك

کوڕێگ هات. کوڕێك هات.

ئەنارێگ خوریا. هەنارێك خورا.

ژنێ هات.ژنێ هات.

بزنیّ مرد.  بزنیّ مرد.

مۆرفیمی (یّ) لەبنەرەتدا هەر مۆرفیمی (ێگ)ە کە کرتاوە، چونکە لەکاتی گۆکردندا بە ئەندازەی (ێگ) درێژ دەکرێتەوە [٥٠].

مۆرفیمی نەناسراوی لە (ش. ز) ەکەدا دەچێتە سەر هەموو ناوێك واتە ئەو ناوانەی بە کۆنسنانت یان بە ڤاولّ کۆتاییان هاتووە، هەروەها دەچنە سەر ناوی تایبەتیش.

وەك

راوێژێگ هات.   راوێژێك هات.

چرۆییّ خەفت.چرۆییّ نووست.

راوێژێگ هات




ئەو ناوانەی کۆتاییان بە دەنگی ڤاولّ هاتووە و مۆرفیمی (یّ)ی نەناسراوی وەردەگرێت ئەوا مۆرفیمی (ی) نیمچە ڤاولّ دەچێتە نێوان ناوەکە و مۆرفیمە نەناسراوەکە.

وەك:

---

٥٠- (س.پ)، ٢٠٠٤: ١٦

چرۆیێ هات.

هاوڕێیێ خەنی.

٣ - مۆرفیمی ناسراوی كۆ: دەچێتە سەر ناوی تاك و دەیكاتە ناوێكی كۆی ناسراو و دەبێتە دیارخەری دوای سەرەی گرێ ناوییەكە، مۆرفیمی كۆ بریتییە لە (ا ن) ئەم مۆرفیمە لەگەڵ ئەو ناوانە دێت كە مۆفیمی (ەگە) ی ناسراویان پێوەیە.

گ.ن ⇐ ناو + ان

وەك:

دارەگان مەورن. دارەكان مەبرن.

ژنەگان كەفتن. ژنەكان كەوتن.

قەڵەمەگان شكیان. قەڵەمەكان شكان.

میەگان فروشتمان. مەرەكانمان فرۆشت

قەڵەمەگان شكیان



مۆرفیمی ناسراوی کۆ بە پێی یاسای سەرەوە لە (ەگە + ان) پێك دێت، بـەڵام لەگـەڵ ئــەو ناوانەی کۆتاییان بە دەنگی ڤاوڵ هاتووە، (ە)ی (ەگــە)ی ناســراوی لــە ناودەچــێت بــۆ ئــەوەی هێشوو ڤاوڵ درووست نەبێت.

وەك:

مانگاگان دوشیان.    مانگاگان دۆشران.

پەردەگان دڕیان.پەردەکان دران.

هەندێك جار مۆرفیمی (ەگە) هەردوو دەنگی (ە)ی دەکرتێت تانهــا (گ) لــێ دەمینێتــەوە ئەم دۆخەش تەنها لەگەڵ  (ان) ی کۆ روودەدات  کاتێك ناوەکە کۆتای بە دەنگی  (ا، ە) دێت.

وەك:

داناگان هاتن .     داناکان هاتن.

مانگاگان دوشیان.مانگاکان دۆشران.

پەردەگان دڕیان. پەردەکان دران.

پەنجەرەگان شکیان   پەنجەرەکان شکان.

جگە لە ناوی گشتی ناوی تایبەتیش لە (ش. ز)ەکەدا مۆرفیمی (ان)ی کـۆ وەردەگرێـت چ لەگەڵ ناوێك کۆتایی بە دەنگی  کۆنسنانت هاتبێت یان کۆتایی بە دەنگی ڤاوڵ هاتبێت.

وەك:

زازاگان لکیان وەتورکیاوە. زازاکان لکان بە تورکیاوە.

برواگان لە بان خانگ خەفتن.برواکان لە سەرخانوو نووستن.

٤ -  مۆرفیمی کۆی نەناسراوی (گەل) و ئەلۆمۆرفەکانی (ەیل، یل)

گرێی ناوی فراوان دەکرێت لە دواوە بە یارمــەتی مــۆرفیمی کــۆی نەناســراو، مۆرفیمیــە نەناسراوەکەش دەبێتە دیارخەری دواوەی گرێی ناوییەکە.

دەتوانین ئەم یاسایەی بۆ دابرێژین.

گ.ن ⇐ ناو  +  (گەل، ەیل ، یل، ەل)

وەك:

کوڕگەل هاتن.  کوڕگەل هاتن؟؟ (کوڕەگان هاتن.)

ژنەیل کەفتن.  ژنان کەوتن.

گایل خەفت.   گایەل نووست؟؟ (گایەکان نووستن.)

هەردوو مۆرفیمی (ەیل، یل) لەنەژاد دا ئـەلۆمۆرفی (گـەل) ن. چـونکە دەنگـی یەکـەمی (گەل)کرتاوە و دەنگی (ی) خلیسکاوەتە نێـوان (ە - ل) بـووە بـە (ەیـل)، بـەڵام (یـل) پـاش کرتاندنی (ە) پەیدابووە، دەچێتە سەر ئەو ناوانەی بـە دەنگـی (ا)  کۆتایـان هـاتووە،  وەکـو (گایل).

لەناوچەکانی سـنوری عێـراق زۆربەدگمـەن (ەل) بـەکاردێت، تەنانـەت لەناوچـەکانی  ( سەرپولزهاو،  کرماشان)ش  زۆربەدگمەن (ەل) بەکاردێت [٥١].

دەفتەرەیل دریان




لەم (ش. ز. ف)دا ناوەکانی وەك (قەڵەم، دەفتەر،...تـاد) دەتـوانن هـەردوو مـۆرفمی(ان، ەیل)ی کۆی ناسراو و نەناسراو وەربگرن.

وەك:

قەڵەمەگان شکیان.(کۆی ناسراو)

قەڵەمەیل شکیان.  (کۆی نەناسراو)

---

٥١- هیوا زەندی، للكتابة باللهجة الفيلية، ٢٠٠٧: ٢٧

له (ز. ك. خ)دا  هەندێك ناوی گشتی دەتوانن مۆرفیمی كۆی ناسراو وەرگرن، بەڵام ناتوانن مۆرفیمی كۆی نەناسراوی وەربگرن.

وەك:

قەڵەمەكان شكان.

قەڵەمان شكان ٭

## ٢- جێناوی خاوەنیەتی:

گرێی ناوی بە جێناوی لكاو (م، د/ ت، ی،  مان، تان، یان)  لە دواوە فراوان دەكرێت وچەمكی خاوەنێتی دەبەخشێت، ئەم جێناوە راستەوخۆ بە سەرەی گرێ ناویەكەوە دەلكێت و دەبێتە دیارخەری دوای سەرەكە، جا سەرەی گرێی ناوییەكە ناوی گشتی یان ناوی تایبەتی بێت.

گ.ن ⟸ ناو + جێناوی لكاو

وەك:

باوگم هات.   باوكم هات.

مناڵمان خەنی.   منداڵمان پێكەنی.

ژنت خەفت. ژنت خەوت.

داڵگم هات.   دایكم هات .

داڵگ (ت /د) هات.   دایكت هات.

داڵگ(ی) هات.  دایكی هات.

داڵگمان هات.    دایكمان هات.

داڵگ (ت /د) ان هات.دایكتان هات

داڵگیان هات.    دایكیان هات.

ژنم خەنی.   ژنم پێكەنی.

ژن (ت /د) خەنی.  ژنت پێكەنی.

ژنی خەنی. ژنی پێكەنی.

ژنمان خەنی.     ژنمان پێکەنی.

ژن (ت /د) ان خەنی.   ژنتان پێکەنی.

ژنیان خەنی.ژنیان پێکەنی.

دالگت هات




**٣- لەقەب:**

لە دواوە گرێی ناوی سادە فراوان دەکات بەبێ هیچ مۆرفیمێکی خستنەسەر بە ناوەکەوە دەلکێت و دەبێتە دیارخەری دواوەی سەرەی گرێی ناوییەکە، هەمان ئەگەرەکانی (بریناو) کەباسمان کرد لە (لەقەب) بەدی دەکرێت، بۆیە جارێکی تر لێیان نادوێین.

گ.ن ⟸ ناو + لەقەب

وەك:

هەسەن ئاغا هات .    حەسەن ئاغا هات .

حەمە پاتشا خەنی.  حەمە پاشا پێکەنی.
عەلی فەیلی ها لە بەغا.  عەلی فەیلی لە بەغدایە.

حەمە پاتشا خەنی:




**٤- چاوگ:**

چاوگ لە دواوەی گرێی ناوی دەتوانێت گرێیەکە فراوان بکات لەگرێیەکەدا ناو دەبێتە سەرە و(چاوگ) ش دەبێتە دیارخەی دوای سەرەی گرێ ناوییەکە.

گ.ن ⇐ ناو + چاوگ

وەك:

دڵ سوزیان ناخوەشە.     دڵ سوتان ناخۆشە.

هۆرە چرین خوەشە [٥٢].   هۆرە ووتن خۆشە.

---

٥٢- (فەیلی)یەکان لە پرسەی پیاوان (هۆر)ەیان چریوە،  لە پرسەی ژنانش (چەمەری)یان چریوە.

دڵ سوزیان ناخوەشە




**٥- ژمارە:**

ژمارە گرێی ناوی فراوان دەکات، دەبێتە دیارخەری دوای سەرە گرێی ناوییەکە. جۆرەکانی ژمارەمان باس کرد بۆیە لێرەدا تەنها نموونەیان بۆ دێنینەوە.

گ.ن ⇐ ناو + ژمارە

وەک:

کوڕ دوم هات. کوڕی دووم هات.

شامی هەفتم خوریا. شوتی حەوتم خورا.

ژن دییەم هات. ژنی دەیەم هات.

کوڕ دوومین کەفت . کوڕی دووەمین کەوت .

شامی هەشتمین خوریا. شوتی هەشتەمین خورا.




**٦- لاڕستە:**

لاڕستە ئەو ڕستە شوێنکەوتووەیە کە سەربەخۆیی سینتاکسی نییە و بەشێکە لە ڕستەی سەرەکی بە یارمەتی مۆرفیمی گەیەنەری (کە) بە ڕستەی سەرەکی یەوە دەلکێت، دەتوانێت لە دواوە گرێی ناوی فراوان بکات لەگرێیەکەدا ناو دەبێتە سەرە و لاڕستەی گەیەنەریش دەبێتە دیارخەی دوای سەرەی گرێ ناوییەکە.

دەتونین ئەم یاسایەی بۆ دارێژین:

گ.ن ⟸ ناو + لاڕستە

وەك:

راوێژ، کە لە قەی دالگت بوی خەفت. راوێژ، کە لە تەنیشت دایکت بوو نووست.

کەموتەر، کە لە بان دارنیشت ڕەنگینە. کۆتر، کە لە سەر دار نیشت جوانە.

ژن کە، لە بان کاریز نیشت قسێ ئویشێ.ژن، کە لە سەر کانی دانیشت قسە دەڵێ.

منالێ، كه بویچگ بوی ئەژنەڤێ.منداڵ، كه بچووك بوو تێدەگات.

ژن، كه له قەی كاریزنیشت قسێ ئویشێ.




**٢ - دیارخەرەكانی دوای سەرە بە یارمەتی مۆرفیمی خستنە سەر:**

أ - گرێی ناوی سادە فراوان دەكرێت بە یارمەتی دیارخەرەكانی دواوە ئەم دیارخەرانەش بە شێوەیەكی ناراستەوخۆ بە یارمەتی مۆرفیمی خستنە سەری (ی) بە سەرەكەوە دەلكێن و دەبنە دیارخەری دوای سەرەی گرێی ناوییەكە. بەم شێوانەی لای خوارەوە:

**١- گرێی ناوی:**

گرێی ناوی بە گرێی ناوی لەدواوە فراوان دەكرێت بە یارمەتی مۆرفیمی خستنە سەری (ی)، گرێی ناوییە زیادەكەش دەبێتە دیارخەر بۆ گرێ بنەرەتییەكە، واتە دەبنە سەرە و دیارخەر.

گ.ن ⟸ ناو + ی + گ.ن

وەك:

شنەی ژن خەفت. شنەی ژن نووست.

راوێژی کوڕ هات. راوێژی کوڕ هات.

ئاوی کاریز بڕیا. ئاوی کانی بڕا.

چاوانی خاڵۆم ها لە ئاوایی. چاوانی خاڵۆم لە دێیە.

شنەی دختۆر زانایە. شنەی دکتۆر زانایە.

گەشبینی میمگم ڕەنگینە.گەشبینی پورم جوانە.

کەموتەرەگەی راوێژ باڵ گرد. کۆترەکەی راوێژ فری.

راوێژی کوڕ هات




دەتوانین گرێی ناوی سادە فراوان بکەین بە هەمان دیارخەری دوای سەرە، واتە بە زیادکردنی زیاتر لە دیارخەرێك لە دوای سەرەی گرێی ناوییەکە هەموو دیاخەرەکانی دوای سەرەش بە یارمەتی مۆرفیمی (ی) خستنە سەر پێکەوە دەلکێنرێت و دەبنە دیارخەر بۆ سەرەی گرێ ناوییەکە.

وەك:

شنەی ژنی پاتشا خەفت.  شنەی ژنی پاشا نووست.

راوێژی کوڕی برام هات.   راوێژی کوڕی برام هات.

ئاوی کاریزی کوردستان فرەس.ئاوی کانی کوردستان زۆرە.

شنەی ژنی پاتشا خەفت




## ٢- ئاوەڵناو:

ئاوەڵناو گرێی ناوی سادە فراوان دەکات و دەبێتە دیارخەری دوای سەرە بە یارمەتی مۆرفیمی خستنەسەری (ی).

گ. ⟸ نناو + ی + ئاو

وەك:

ئەناری تورش نەخوە. هەناری تورش مەخۆ.

وەفری چەرمگ دویم. بەفری سپیم دیت.

دویتەی ڕەنگین خەفت.     کچەی جوان نووست ؟؟(کچی جوان نووست)

کوڕەی زەرنگ هات.   کوڕی زیرەك هات.

ئەناری تورش نەخوە.




گرێی ناوی دەتوانرێت زیاتر فراوان بکرێت بە یارمەتی زیاتر لە ئاوەڵناوێك، ئەویشبە یارمەتی مۆرفیمی (ی) خستنەسەر هەموویان لە گرێیەکدا پێکەوە دەلکێنێت، واتە هەموو ئاوەڵناوەکانی دوای سەرە دەبنە دیارخەر بۆ سەرەی گرێی ناوییەکە.

وەك:

ئەناری تورشی گەنیاگ نەخوە. هەناری تورشی گەنیو مەخۆ.

دویتەی ڕەنگینی شیرین خەفت.کچەی جوانی شیرن نووست. ؟؟

(کچی جوانی شیرین نووست.)

**دویتەی ڕەنگینی شیرین خەفت**




هەندێ جار لەم (ش. ز)دا مۆرفیمی(ی) خستنەسەر زۆر بە كزی گۆدەكرێت تەنانەتلە هەندێ جار هەر گۆناكرێت.

وەك:

كوڕ دانا هات. كوڕی دانا هات.

ژن زانا وەسیا. ژنی زانا راوەستا.

ب - مۆرفیمی (ە) [٥٣]:

لەو بارانەی كەسەرەی گرێیەكە بە مۆرفیمی ناسراو ی (ەكە) فراوان كرابێ ئەوا ئاوەڵناو بە یارمەتی مۆرفیمی خستنەسەری (ە) بەسرەكەیانەوە دەلكێت.

گ.ن ⟸ گ.ن + ە + ئاو

---

٥٣- بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ئەركەكانی مۆرفیمی (ە) بروانە ئەم سەرچاوەیە:

د. رەفیق شوانی، چەند بابەتێكی زمان و ڕێزمانی كوردی، ٢٠٠١: ٢٣١ - ٢٥٢

وەك:

كوڕە داناگە هات.كوڕە داناكە هات .

قەڵەمە دریژەگە شكیا.  قەڵەمە درێژەگە شكا.

ئەنگویرە سەوزەگە وەتامە    ترێیە سەوزەكە بەتامە.

دویتە رەنگینەگە خەفت.    كچە جوانەكە نووست.

قەڵەمە دریژەگە شكیا




دەتوانرێت ئەم گرێیە فراوان بكرێت بە دیارخەرەكانی دوای سەرە كە لە ناوخۆیاندا فـراوان دەكرێت، لە هەموو فراوانكردنێكـدا مـۆرفمی (ە) دەكەوێتـە نێـوان دیارخـەرەكان مـۆرفیمی ناسراویش دەكەوێـتە كۆتایی دیارخەرەكە.

وەك:

ژنه ڕەنگینه چەرمگه شیرینەگه هات.  ژنه جوانه سپیه شرینەکه هات.
داره دریژه سەوزه ڕەنگینەگه شکیا.  داره درێژه سەوزه جوانەکه شکا.
کەموتره دەنویگ دریژه چەرمەگەگه باڵ گرد.     کۆتره دەنووك درێژه سپیەکه فری.




لـەم جـۆره گـرێ ناوییـەدا، ئەگـەر دیارخـەرەکان کۆتاییـان بـە دەنگـی ڤـاوڵ هاتبێـت ئـەوامۆرفیمی خسـتنه سـەری (ە) لـە نێـوان دیارخـەرەکانی دوای سـەرەی گـرێ ناوییەکـە دەرناکەوێت.

وەك:

کوڕه دانا زاناگان هاتن.     کوڕه دانا زاناکان هاتن.

ژنه دانا زانا سیاگان خەفتن. ژنه دانا زانا رەشەکان نووستن.

### ٣- جێناوی سەربەخۆ:

جێناوی سەربەخۆ لە دوای سەرەی گرێی ناوی دەتوانێت گرێیەکە فراوان بکات بە یارمەتی مۆرفیمی خستنە سەری (ی) لەگرێیەکەدا ناو دەبێتە سەرە و جێناوی سەربەخۆش دەبێتە دیارخەی دوای سەرەی گرێ ناوییەکە.

گ.ن ⟸ ناو + ی + جێناوی سەربەخۆ

وەك:

ژنی ئەو هات.ژنی ئەو هات.

کوڕی ئیمە کەفت.کوڕی ئێمە کەوت.

دالگی ئوان خەفت. دایکی ئەوان نووست.

دالگی ئوان خەفت




لەم جۆرە گرێیەدا جێناوی سەربەخۆ ناتوانێت گرێی ناوی لەوە زیاتر فراوان بکات، چونکە جێناوی سەربەرخۆ بە یارمەتی مۆرفیمی خستنەسەری (ی)، لە ناو خۆیدا ناتوانێت بەدوای یەکتردا بێت، واتە گرێی ناوی ناتوانێت زیاتر لە دیارخەرێکی جێناوی سەربەخۆ وەربگرێت.

وەك:

کوڕی ئیوەی من هات ٭

ژنی ئیمەی ئەو کەفت. ٭

## ٤- ژمارە:

ژمارە گرێــی نــاوی فــراوان دەکــات بەیارمــەتی مــۆرفیمی خســتنە ســەری (ی)، دەبێتــە دیارخەری دوای سەرە گرێی ناوییەکە[٥٤]. جۆرەکانی ژمارەمان باس کـرد بۆیــە لێــرەدا تــەنها نموونەیان بۆ دێنینەوە.

گ.ن ⟸ گ.ن + ی + ژمارە

وەك:

کوڕی دوم هات. کوڕی دووەم هات.

ژنی دوانزەم خەفت. ژنی دوانزەیەم نووست.

قەڵەمی بیسەم شکیا.قەڵەمی بیستەم شکا.

قەڵەمی بیس و دوم شکیا. قەڵەمی بیست و دووەم شکا.

قەڵەمی دومین شکیا.قەڵەمی دووەمین شکا.

قەڵەمی هەفتا شکیا.قەڵەمی حەفتا شکا.

ژمارەی کەرتی لە (ز. ف) ناتوانێت بەیارمــەتی مــۆرفیمی خســتنە ســەری (ی) ببێتــە دیارخەری دوای سەرەی گرێی ناوی .

کوڕ ی دو لە چوار هاتن ٭

ژنی دولەسێ خاسن ٭

پەنچی کەرتی زەویەگە فروشمان ٭

---

٥٤- ژمارە لە (ش. ز. ف)ی لە پێش سەرە و لە دوای سەرەی گرێی ناوییەوە دەردەکەوێت، لەپێش سەرە بەبێ مۆرفیمی خستنەسەر دەبێتە دیارخەر لەپێشتر باسمان لێکرد، بەڵام لە دوای سەرەی گرێی ناوی بەیارمەتی مۆرفیمی خستنەسەری (ی) دەبێتە دیارخەردوای سەرە.

کوڕی دوم هات.




**٥ - چاوگ:**

**چاوگ لە دوای سەرەی گرێی ناوی دەتوانێت گرێیەکە فراوان بکات بە یارمـەتی مـۆرفیمی خستنە سەری (ی) لەگرێیەکەدا ناو دەبێتە سەرە و (چاوگ) ش دەبێتە دیارخەی دوای سـەرەی گرێ ناوییەکە.**

**گ.ن ⇐ ناو + ی + چاوگ**

**وەك:**

**کتاوی خوەنستن هەسم. کتێبی خوێندنم هەیە.**

**زەویی کاڵێن خوەشە.زەوی کێڵان خۆشە.**




**٦ - گرێی ئاوەڵکاری:**

گرێی ئاوەڵکاری دەتوانێت لە دواوە گرێـی نـاوی فـراوان بکـات بـە یارمـەتی مـۆرفیمی خستنەسەری (ی) لەگرێیەکەدا ناو دەبێتە سەرە و گرێی ئاوەڵکاریش دەبێتـە دیارخـەی دوای سەرەی گرێ ناوییەکە.

گ.ن ⟸ ناو + ی + گ. ئاک

وەك:

راوێژی قەی چاوان بویچگە. راوێژی لای چاوان بچووکە.

کەموتەری بان دارەگە باڵگرد. کۆتری سەردارەکە فری.

ژنی ژیر قەمەرەگە خەفت. ژنی ژێر کەپرەکە نووست.

راوێژی قەی چاوان بویچگە




### ٢-٤-٦ گرێی ناوی لێكدراو:

گرێی ناوی لێكدراو لە دوو گرێی سادەترین یان زیاتر پێك دێت، یـان لـە دوو گرێـی نـاوی سادە یان زیاتر، یاخود لە سادەترین گرێـی نـاوی و گرێیـەكی سـادە یـان زیـاتر پێـك دێـت، بەواتایەكی تر

((هەریەك لە گرێ سادەكان سەربەخۆن لە رووی فۆرم و واتاوە.))[٥٥].

ئەم گرێیانە بە یارمەتی چەند مۆرفیمێكی لێكدەر لێك دەدرێت، دەتوانین جۆری مۆرفیمـە لێك دراوەكانی گرێیەكان بەم شێوانە دەست نیشان بكەین:

**١- ئەو گرێ لێكدراوانەی بە یارمەتی مۆرفیمی لێكدەری (و) درووست دەبن:**

أ- لێكدانی دوو ناو یان زیاتر:

١- سادەترین گرێی ناوی بەدوو گرێ یان زیاتر بە یارمەتی مۆرفیمی لێكـدەری (و) گرێـی ناوی لێكدراو درووست دەكات.

گ.ن ⟸ گ.ن + و + گ.ن +.....

٥٥- ساجید ەعبداللە فرهادی و د.طالب حسین علی، گرێ و جۆرەكانی گرێ لە زمانی كوردی دا، ٢٠٠٦: ٧٣٩

وەك:

گورگ و میە وە یەكەوە هاوخوەن. گورگ و مەر بە یەكەوە ئاو دەخۆن.

راوێژ و چاوان و ئاوات هاتن.  راوێژ و چاوان و ئاوات هاتن.

شنە و چرا و بروا هاتن.  شنە و چرا و بروا هاتن.

دار و قەڵەم و میز شكیا   دار و قەڵەم و مێز شكا.     شامی و ئـەنگویر و ئـەنار خوریـا شووتی و ترێ و هەنارخورا.

راوێژ و چاوان و ئاوات هاتن




دەتوانین ئەم ناوانە جێ گۆڕكێ (پاش و پێش) یان پێ بكەین بەبێ ئەوەی لە ئەرك و واتایان بگۆڕێـت، چـونكە هـەموو ناوەكـان بەیارمـەتی مـۆرفیمی لێكـدەری (و) لێـك دراون، واتـە هەموویان یەك نرخیان هەیە [٥٦].

وەك:

٥٦- ئەگەر مۆرفیمی ناسراوی لە سەر یەكێك لە سەر گرێناویەكان بێت، ئەوا ئەو نرخەی نامێنێت:

بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ئەو پنتە بروانە ئەم سەرچاوەیە :

د.كوردستان موكریانی، سینتاكسی ڕستەی كوردی، ٢٠٠٠: ١٤-١٥

راویَژ و چاوان و ئاوات هاتن. راویَژ و چاوان و ئاوات هاتن.
چاوان و راویَژ و ئاوات هاتن.چاوان و راویَژ و ئاوات هاتن.
ئاوات و چاوان و راویَژ هاتن.ئاوات و چاوان و راویَژ هاتن.
راویَژ و ئاوات و چاوان هاتن. راویَژ و ئاوات و چاوان هاتن.

ئەم ڕستانەی سەرەوە کە یەك نرخیان هەیە و بەیارمەتی مۆرفیمی لێکدەری (و) لێك دراون، واتە هەر دیارخەرێك بۆ هەر یەکێکیان زیاد بکرێت دەشێت هەر دوو گرێ ناویەکەی تر بەهەمان دەسەلآت دیارخەرەکە بۆ خۆیان کێش بکەن

وەك:

کوڕ و ژنی زانا هات.

وشەی (زانا) دەشێت بۆ هەر دووکیان بگەرێتەوە، چونکە بە مۆرفیمی لێکدەری (و) لێك دراون.

ب- ئەو گرێ ناویانەی بە یارمەتی مۆرفیمی (و) لە یەك دەدرێن لە ڕووی سینتاکسەوە هەمان دەسەلآتیان هەیە و سەر بەخۆن لە ڕووی ڕۆنان دا، جا لە هەر بارێك دابێت بە مۆرفیمی (و) لە یەك دەدرێن (تاك و کۆی ناساراو یان نەناسراو یان دیارخەری تایبەتی بە خۆیان هەبێت.. تاد).

وەك:

کوڕەگە و منالّەگە و ژنەگە هاتن. کوڕەکە و مندالّەکە و ژنەکە هاتن.
ئەنارەگە و شامییەگە و خەرویزەگە گەنیا. هەنارەکە و شووتیەکە و کالّەگەکە گەنیین.

کوڕێگ و منالّێگ و ژنێگ هاتن. کوڕێك و منالّێك و ژنێك هاتن.
دارێگ و قەلّەمێگ و کەمچگێگ شکیا.دارێك و قەلّەمێك و کەوچکێك شکا.

کوڕەگان و منالّەگان و ژنەگان هاتن.کوڕەکان و مندالّەکان و ژنەکان هاتن.
دارەگان و قەلّەمەگان و کەمچگەگان شکیان. دارەکان و قەلّەمەکان و کەوچکەکان شکان.

کورِەیل  و منالّەیل و ژنەیل هاتن. کوڕان و مندالان و ژنان هاتن.
ئەنارەیل و سیڤەیل و شامییەیل گەنیان.   هەناران و سێوان و شووتیان گەنیین ؟؟
(هەنارەکان و سێوەکان و شامییەکان گەنیین)
راوێژ و ژنێگ و کورِەگان هاتن. راوێژ و ژنێك و کورِەکان هاتن.
کورِەگان و چاوان و ژنێگ و راوێژ هاتن.کورِەکان و چاوان و ژنێك و راوێژ هاتن.

**٢- لێکدانی دوو چاوگ یان زیاتر:**

به لێکدانی دوو چاوگ یان زیاتر گرێی ناوی لێکدراو بەیارمەتی مۆرفیمی لێکدەری (و) درووست دەبێت.

گ.ن ⟸ چاوگ + و + چاوگ + و + چاوگ

وەك:

**خوەنستن** و **خەنستن** و **خەفتن** وەخت خوەی خوەشه .

خوێندن و پێکەنین و نووستن کاتی خۆی خۆشه.

**خوەنستن** و **خەنستن** و **خەفتن** و وەخت خوەی خوەشه



چاوگ لە گرێی ناوی لێکدراودا دەتونێت جێگۆڕکێ بکات.

وەك:

**خوەنستن** و **خەنستن** و **خەفتن** و وەخت خوەی خوەشە.

**خەنستن** و **خوەنستن** و **خەفتن** و وەخت خوەی خوەشە.

**خەفتن** و **خەنستن** و **خوەنستن** و وەخت خوەی خوەشە.

### ٣- لێکدانی دوو جێناو یان زیاتر:

جێناوی سەربەخۆ بە دوو جێناو یان زیاتر بە یارمەتی مۆرفیمی لێکدەری (و ) دەتوانێت گرێی ناوی لێکدراو درووست بکات.

گ.ن ⟸ جێناوی سەربەخۆ + و + جێناوی سەربەخۆ + و + جێناوی سەربەخۆ

وەك:

من و تن جگین. من و تۆ چووین.

ئیمە و تن و ئەو خەفتین. ئێمە و تۆ و ئەو نووستین.

ئیمە و ئیوە کەفتین. ئێمە و ئێوە کەوتین.

ئێمە و تن و ئەو خەفتین



ئەم جێناوە سەربەخۆیانە دەتوانن جێگۆڕكێ بكەن بەبێ ئەوەی لە ئـەرك و واتـای ناوەكـان كەم بكەنەوە.

بەڵام لەكاتی جێگۆركێدا هەندێك جار گۆكردنییان لە سەر زار قورسە.

ئیمە و تن و ئەو خەفتین.ئێمە و تۆ و ئەو نووستین.

ئەو تن و ئیمە خەفتین. ئەو و تۆ و ئێمە نووستین.

تن و ئەو و ئیمە خەفتین. تۆ و ئەو و ئێمە نووستین.

## ٤- لێكدانی ناوێك و جێناوێك یان زیاتر:

ناوێك و جێناوێك یان زیاتر بەیارمـەتی مـۆرفیمی لێكـدەری (و) گرێـی نـاوی لێكـدراو درووست دەكات.

گ.ن ← ناو + و + جێناوی سەربەخۆ + و + ناو

وەك:

راوێژ و تن خەفتن. راوێژ و تۆ نووستن.

چاوان و ئیوە كەفتن. چاوان و ئێوە كەوتن.

چاوان و تن و راوێژ خەفتن. چاوان و تۆ و راوێژ كەوتن.

لەم گرێ لێكدراوانەدا گرێ سادەكان واتە ناو و جێناوی سـەربەخۆ دەتـوانن جێگـۆڕكی بكەن.

وەك:

راوێژ و تن خەفتن.راوێژ و تۆ نووستن.

تن و راوێژ خەفتن. تۆ و راوێژ نووستن.

چاوان و تن و راوێژ خەفتن.چاوان و تۆ و راوێژ كەوتن.

تن و چاوان و راوێژ خەفتن. تۆ و چاوان و راوێژ كەوتن.

چاوان و تن و راوێژ خەفتن




**٥- لێكدانی دوو ئاوەڵناو یان زیاتر:**

گرێی ناوی لێكدراو بە لێكدانی دوو ئاوەڵناو یان زیاتر بە یارمەتی مۆرفیمی لێكدەری (و) گرێی ناوی لێكدراو درووست دەكات.

وەك:

شنە و داڵگی چەرمگ و سیا لێك ناكەنەو. شنەو دایكی سپی و ڕەش لێك ناكەنەوە.

داری گەورە و بچوویك مەورن. داری گەورە و بچووك مەبرن.

شنه و دالگی چەرمگ و سیا لێك ناكەنەو




**٢-٤-٧ ٢- ئەو گرێ لێكدراوانەی بەیارمەتی مۆرفیمی لێكدەری (وەل) درووست دەبن:**

بەم شێوانەی لای خوارەوە:

١- لێكدانی دوو ناو یان زیاتر:

أ- بەدوو گرێ یان زیاتر بە یارمەتی مۆرفیمی لێكدەری (وەل) دەتوانرێت گرێی ناوی لێكدراو درووست بكرێت.

گ.ن ⟸ گ.ن + وەل + گ.ن

وەك:

ڕاوێژ وەل چاوان هات. ڕاوێژ لەگەڵ چاوان هات.

دار وەل خەلیا سوزی. دار لەگەڵ دەغلّ سووتا.

گورگ وەل میە ئاو خوەن ! گورگ لەگەڵ مەر ئاو دەخوات ؟؟

( گورگ لەگەڵ مەر ئاو دەخواتەوە)!

راوێژ وەل چاوان هات




ئەم ناوانە دەتوانن لە گرێی ناوی لێكدراو جێگـۆڕكێ بكـەن، بـەڵام هێـز دەوری سـەرەكی دەبینێت لەسەر ناوەكان كە مەبەستی قسەكەر لەسەر كام لە ناوەكانە، واتە نرخی یـەكیان لـە ناوەكەی تر زیاتر دەدات بە دەستەوە[٥٧].

ب- ئەو گرێ ناویانەی بە یارمەتی مۆرفیمی (وەل) لە یەك دەدرێن لە ڕووی سینتاكسـەوە هەمان دەسەڵاتیان هەیە و سەر بەخۆن لە ڕووی ڕۆنانەوە، جا لە هەر بارێك دابێت بە مۆرفیمی (وەل) لە یەك دەدرێن (تاك و كۆی ناسراو یـان نەناسـراو یـان دیارخـەری تایبـەت بـە خۆیـان هەبێت.... تاد).

وەك:

كوڕەگە وەل ژنەگە هات.كورەكە لەگەڵ ژنەكە هات.

---

٥٧- بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی هێز بڕوانە :

أ - وریا عومەر ئەمین، هێز و ئاواز، ١٩٩٤: ١٣-١٤

ب - ئەورەحمانی حاجی مارف، زمانی كوردی لە بەڕۆشنایی فۆنەتیكدا ، ١٩٧٦: ٦٩

ج - غازی فاتح وەیس فۆنەتیك، ١٩٨٤: ١٥ .

دارەگە وەل قەڵەمەگە شكیا. دارەكە لەگەڵ قەڵەمەكە شكا.
كوڕێگ وەل ژنێگ هات. كوڕێك لەگەڵ ژنێك هات.
دارێگ وەل قەڵەمێگ شكیا. دارێك لەگەڵ قەڵەمێك شكا.

كوڕەگان وەل ژنەگە هاتن. كوڕەكان لەگەڵ ژنەكە هاتن.
دارەگان وەل قەڵەمەگان شكیان. دارەكان لەگەڵ قەڵەمەكان شكان.

كوڕەیل وەل ژنەیل هاتن. كوڕان لەگەڵ ژنان هاتن.
دارەیل وەل قەڵەمەیل شكیان. داران لەگەڵ قەڵەمان شكان؟؟
(دارەكان لەگەڵ قەڵەمەكان شكان)

### ٢- لێكدانی دوو جێناو:

بە لێكدانی دوو جێناوی سەربەخۆ بــە یارمــەتی مــۆرفیمی لێكـدەری (وەل) گرێــی نــاوی لێكدراو درووست دەبێت.

گ.ن ⇐ جێناوی سەربەخۆ + وەل + جێناوی سەربەخۆ

وەك:

ئەو وەل ئیوە هات. ئەو لەگەڵ ئێوە هات.
من وەل تن خەفتم. من لەگەڵ تۆ نووستم.
ئیمە وەل ئیوە قەومین. ئێمە لەگەڵ ئێوە خزمین.

ئەو وەل ئیوە هات




**٣- لێكدانی ناوێك و جێناوێك:**

به لێكدانی ناوێك و جێناوێك به یارمەتی مۆرفیمی لێكدەری (وەل) گرێی نـاوی لێكـدراو درووست دەبێت.

گ. ن ⇐ ناو + وەل + جێناو

وەك:

راوێژ وەل مـن خەفت.راوێژ لەگەڵ من نووست.

چاوان وەل تـن كەفت. چاوان لەگەڵ تۆ كەوت.

راوێژ وەل ئیوە هات.راوێژ لەگەڵ ئێوە هات.

راوێژ وەل من خەفت




**٤- لێکدانی دوو چاوگ:**

دوو چاووگ بە یارمەتی مۆرفیمی لێکدەری (وەل) لێکدەدرێت و گرێی ناوی لێکدراو درووست دەکات.

گ.ن ⇐ چاوگ + وەل + چاوگ

وەك:

خنگیان وەل سوزیان ناخوەشە.خنکان لەگەڵ سوتان ناخۆشە.

خەنستن وەل خەفتن وەخت خوەی خوەشە. پێکەنین لەگەڵ نووستن کاتی خۆی خۆشە.

خنگیان وەل سوزیان ناخوەشە




**٢-٤-٨ / ٣- لێكدانی چەند گرێیەك بە یارمەتی مۆرفیمی (و) و (وەل) لە گرێی لێكدراود:**

**١- سادەترین گرێی ناوی بە دوو گرێی ناوی یان زیاتر بە یارمەتی مۆرفیمی لێكدەری (و) لەگەڵ (وەل) گرێی ناوی لێكدراو درووست دەكات.**

گ.ن ⟸ گ.ن + و + گ.ن + وەل + گ.ن

وەك:

راوێژ و چاوان وەل ئاوات هاتن. راوێژ و چاوان لەگەڵ ئاوات هاتن.

شنە و چرا وەل بروا خەفتن. شنە و چرا لەگەڵ بروا نووستن.

دار و قەڵەم وەل قاپی شكیان. دار و قەڵەم لەگەڵ دەرگا شكان.

ئەم ناوانە دەتوانن لە ناو ڕستەكاندا جێگۆڕكێ بكەن:

وەك:

راوێژ وەل چاوان و ئاوات خەفت. راوێژ لەگەڵ چاوان و ئاوات نووست.

چاوان وەل راوێژ و ئاوات خەفت. چاوان لەگەڵ راوێژ و ئاوات نووست.

ئاوات وەل راوێژ و چاوان خەفت.        ئاوات لەگەڵ راوێژ و چاوان نووست.

دار و قەڵەم وەل قاپی شکیان.        دار و قەڵەم لەگەڵ دەرگا شکا.
قەڵەم و دار وەل قاپی شکیان.        قەڵەم و دار لەگەڵ دەرگا شکا.
دار و قاپی وەل قەڵەم شکیان.        دار و دەرگا لەگەڵ قەڵەم شکا.

لە ناو ڕستەکاندا مۆرفیمە لێکدراوەکان دەتوانن جێگۆڕکێ بکەن:
وەك:

راوێژ وەل چاوان و ئاوات هات.        راوێژ لەگەڵ چاوان و ئاوات هاتن.
راوێژ و چاوان وەل ئاوات هاتن.        راوێژ و چاوان لەگەڵ ئاوات هاتن.
دار و قەڵەم وەل قاپی شکیان.        دار و قەڵەم لەگەڵ دەرگا شکان.
دار وەل قەڵەم و قاپی شکیا.        دار لەگەڵ قەڵەم ودەرگا شکا.

هەروەها ئەو ناوانەی بە یارمەتی مۆرفیمی لێکدەری (و) لە گرێیەکەدا لێکدراون دەتوانن لە ناوخۆیاندا جێگۆڕکێ بکەن.
وەك:
راوێژ وەل چاوان و ئاوات هات.راوێژ لەگەڵ چاوان و ئاوات هات.
راوێژ وەل ئاوات و چاوان هات.راوێژ لەگەڵ ئاوات و چاوان هات.

راوێژ وەل چاوان و ئاوات هات



**٢- ئەو گرێ ناویانەی بە یارمەتی مۆرفیمی (وەل)** لە یەك دەدرێن لە ڕووی سینتاكسەوە هەمان دەسەڵاتیان هەیە و لە ڕووی ڕۆنان دا سەر بەخۆن، جا لە هەر بارێك دابێت بە مۆرفیمی (وەل) لە یەك دەدرێن (تاك و كۆی ناساو یان نەناسراو یان دیارخەری تایبەتی بە خۆیان هەبێت..تاد).

وەك:

ئەنارەگە و سیڤەگە وەل خەرویزەگە گەنیا. هەنارەكە و سێوەكە لەگەڵ كاڵەگەكە گەنیین.

كوڕەگە و مناڵەگە وەل ژنەگە هاتن. كوڕەكە و منداڵەكە لەگەڵ ژنەكە هاتن.

كوڕێگ و مناڵێگ وەل ژنێگ هات. كوڕێك و مناڵێك لەگەڵ ژنێك هات.

ئەنارێگ و سیڤێگ وەل خەرویزەییێگ گەنیا. هەنارێك و سێوێك لەگەڵ كاڵەگێك گەنیین.

كوڕەگان و مناڵەگان وەل ژنەگان هاتن.كوڕەكان و منداڵەكان لەگەڵ ژنەكان هاتن.

دارەگان و قەڵەمەگان وەل قاپییەگان شكیان.دارەكان و قەڵەمەكان لەگەڵ دەرگاكان شكان.

كوڕەیل و مناڵەیل وەل ژنەیل هاتن. كوران و منداڵان لەگەڵ ژنان هاتن.

قەڵەمەیل و دارەیل وەل دەفتەرەیل سوزیان. قەڵەمان و داران لەگەڵ دەفتەران سووتان.

**٣- لێكدانی دوو چاوگ یان زیاتر:**

گ.ن چاوگ + و + چاوگ + وەل + چاوگ

وەك:

**خەنستن** و **خەفتن** وەل **گیرستن** **وەخت** خوەی خوەشە.

**پێکەنین** و **نووستن** لەگەڵ **گریان** کاتی خۆی خۆشە.

مۆرفیمە لێکدەرەکانی نێوان ئەم گرێ ناوییە لێکدراوە دەتوانن جێگۆڕکێ بکەن.

وەك:

**خەنستن** و **خەفتن** وەل **گیرستن** **وەخت** خوەی خوەشە.

**گیرستن** وەل **خەنستن** و **خەفتن** **وەخت** خوەی خوەشە.

گریان لەگەڵ **پێکەنین** و **نووستن** کاتی خۆی خۆشە.

**خەنستن** و **خەفتن** وەل **گیرستن** **وەخت** خوەی خوەشە.




## ٤- لێکدانی دوو جێناو یان زیاتر:

گ.ن ⟸ جێناوی سەربەخۆ + و + جێناوی سەربەخۆ + وەل + جێناوی سەربەخۆ

وەك:

تن و ئیمە وەل ئەوان هاتین.

مـن و تن وەل ئەوان خەفتین.

هەر گۆڕانکارییەك لە جێناوەکـان بکرێـت بـە تایبـەتی ئەوانـەی دەکەونـە پـێش و دوای مۆرفیمی لێکدەری (و) جێناوی لکاوی کۆتایی گرێی کارییەکە دەگۆڕێت.

مـن وەل تن و ئەوان هاتم.

ئیمە وەل تن و ئەوان هاتیمن

مـن وەل تن و ئەوان هاتم




**٥- لێکدانی جێناوێك و ناوێك یان زیاتر:**

گرێی ناوی لێکدراو بە ناوێك و جێناوێك یان زیاتر لەو دوو گرێیە پێك دێت بـە یارمـەتی مۆرفیمی لێکدەری (و) لەگەڵ (وەل).

گ.ن ⟸ جێناوی سەربەخۆ + و + جێناوی سەربەخۆ + وەل + ناو

وەك:

مـن و تن وەل راوێژ هاتین. مـن و تۆ لەگەڵ راوێژ هاتین.

ئیمە و ئیو وەل چاوان هاتیمن. ئێمە و ئێوە لەگەڵ چاوان هاتین.

لەم گرێ ناوییەلێکدراوەدا جگە لە مۆرفیمەکانی ( و) و (وەل)، گرێ ناوییە سادەکانیش دەتوانن جێگۆڕکێ بکەن.

وەك:

من و تن وەل راوێژ هاتین. من و تۆ لەگەڵ راوێژ هاتین.

تن و من وەل راوێژ هاتین.تۆ و من لەگەڵ راوێژ هاتین.

راوێژ وەل من و تن هات. راوێژ لەگەڵ من و تۆ هات.

من و تن وەل راوێژ هاتین



## ٢-٥-١ -٢ گرێی کاری:

گرێی کاری بەشێکە لە دوو بەشە سەرەکی یەکەی ڕستە، ((سادەترین ڕستە لە زمانی کوردیدا لە دوو گرێ پێکدێت: گرێی ناوی و گرێی کاری))[٥٨]. ئەم بەشە گرنگەی ڕستە، ((پێویستە وەك ڕۆنانێکی بنجی چەسپاو (اجباری) لەناو چوارچێوەی ڕستەدا تەماشا بکرێت))[٥٩]. بوونی ڕۆنانێکی چەسپاو بەشەکەی تری ڕستە یان هەندێك جار هەموو کەرسەکانی تر (ئاوەڵناو، گرێی نەند،...) دەخاتە هەڵوێستێکی بە سەرپشکی (اختیاری - optional)، دەتوانن لە ڕۆنانی سەرەوەی ڕستەدا دەرنەکەون) ئەمەش بۆ بوونی پاشماوەیان لەناو گرێ کارییەکە دەگەڕێتەوە. کە خوێنەر یان بیسەر بە ئاسانی لە ڕۆنانی سەرەوی ڕستەکە دەگات.

بوونی گرێی کاری پێویستیەکی سەرەکی یە، چ لە ڕۆنانی سەرەوە یان لە ڕۆنانی ژێرەوەی ڕستەدا واتە ڕستە لە زمانی کوردیدا هەرگیز بێ بوونی گرێی کاری درووست نابێت [٦٠]

## ٢-٥-٢ ڕۆنانی گرێی کاری:

گرێی کاری لە (ش. ز. ف)دا وەکو (ش. ز)ەکانی تری زمانی کوردی خاوەن پێکهاتەیەکی ئاڵۆزی ناوەکی و دەرەکی یە و شێوەی جیاواز وەردەگرێت. گرێی کاری پێکهاتووە لە کارێك کە ڕەگەزی سەرەکی یە بوونی لە ڕۆنانەکەدا بە خورتی یە و ناتوانرێت دەستی لێ هەڵبگیرێت یان لە کارێك هەموو ئەو وشە و مۆرفیم و کەرستانەی تر لە دەوری کار کۆدەبنەوە هەموو دەگەڕێتەوە بۆ بەشی کاری ڕستەکە[٦١]..

وەك:

١- گەشبین هات. گەشبین هات.

٢- چاوان کەفت. چاوان کەوت.

٣- ئەو هات. ئەو هات.

---

٥٨- وریا عمر امین، ١٩٨٦: ١٨٥

٥٩- طالب حسین علی، هەندێ لایەن لەپەیوەندی نێوان ڕستە و واتا لە کوردیدا، ١٩٩٨: ٢١

٦٠- محمود فتح الله، کارتەواو کردن لە کوردی دا نامەی ماجستێر، ١٩٩٨: ١٦

٦١- حاتم ولیا محەمەد، فرێزی ناوی و فرێزی کاری لە کرمانجیی ژووروودا، ٢٠٠٠: ٦٦

٤- راوێژ له بان خانگەگه وه کوچگ وازی کرد.    راوێژ له سەر خانووەکه به بەرد یاری کرد.

٥- ژنەگان هیواش هیواش وه ڕەنگینی و خوەشی له شار هاتن.

ژنەکان هێواش هێواش به جوانی وخۆشی له شار هاتن.

٦- منالەگان دویگه وەخنستن دویم.   مندالەکانم دوێنێ بەپێکەنین دیت.

## ٢-٥-٣   ١ - ڕۆنانی ناوەوەی گرێی کاری:

مەبەست له ڕۆنانی ناوەوەی گرێی کاری له زمانی کوردیدا پێکهاتەی چەند مۆرفیمێکی کاره له گرێیەکدا، واته کار له کوردیدا له مۆرفیمێك زیاتر پێك دێت. له رووی ڕۆنانەوە هیچ کارێك له زمانی کوردیدا ساده نییه [٦٢]. هەموو ڕستەیەکی زمانی کوردی به لایەنی کەمەوە گرێیەکی کاری تێدایه به پێی بۆچوونی زۆربەی زمانەوانان هەر گرێیەکی کاری بەلایەنی کەمەوە سێ مۆرفیمی تێدایە، که بریتین له (رەگی کار، مۆرفیمی کات، مۆرفیمی جێناوی لکاو). هەڵبەته رەگی کار مۆرفیمێکی بەندی تەوەرەییه (سەره) خۆی پێویستیەکانی خۆی هەڵدەبژێرێ، پێویسته سەرەکیەکان هەرگیز نابێت لابدرێت، چونکه پێویستی بەخورتین (اجباری - obligatory) وەك مۆرفیمی بەندەکانی (کات)، که به درشتی کاتی روودانی کارەکه دەردەخەن، هەروەها جێناوه لکاوەکان تەنیا ئەوانەن بۆ بکەر و بەرکاری ڕسته دەگەرێنەوە [٦٣]. ((مۆرفیمی رەگی کار مۆرفیمێکی تەوەرەییه و مۆرفیمه بەندەکانی تری بۆ دەگەرێتەوە هەریەك ریزبوونێکی دیاریکراو تایبەت به خۆیان هەیه [٦٤])).

بۆ گرێی کاری له کوردیدا بەلایەنی کەم سێ مۆرفیم له خۆ دەگرێت دەتوانین ئەم یاسایەی بۆ دابرێژین:

گ.ك ⟸ ڕەگی کار + کات + جێناوی لکاو [٦٥]

---

٦٢- محمد معروف فتاح، کار پۆلین کردن بەپێی ڕۆنان، ١٩٨٩: ٤٤

٦٣- د. عەبدوڵلا حوسێن ڕەسول، پوختەیەکی وردی ڕسەسازی کوردی، ٢٠٠٥: ٨-٩

٦٤- دیار علی کمال، ٢٠٠٢: ٥٠

٦٥- طالب حسین علی، ١٩٩٨ : ٢١

لەم یاسایەدا جێناوی لکاو ئەرکی ڕێکەوتن لە نێوان بکەر و کار لە رووی کـەس و ژمـارە دیاری دەکات.

وەك:

(هاتم، خەفت، باڵگرد، رەسین، کردیمن،.....تاد).

| **ڕستە** | **ڕەگ** | **+** | **کات** | **جێناوی لکاو (کەس و ژمارە)** |
|---|---|---|---|---|
| من هاتم. | ها | | ت | م |
| چاوان خەفت. | خەف | | ت | ∅ |
| کەموتەرەگان مردن. | مر | | د | ن |
| ئیمە کەفتیمن. کەف | | | ت | یمن |

چاوان خەفت. من هاتم.

ڕ ڕ



زۆر جار گرێی کاری لە ڕستەدا بە پێی هێزی کارەکە ئەگەر تێپەربێت ئـەوا پێویسـتی بـە بەرکارێك دەبێت، کە لە شێوەی گرێیەکی ناویدا لەگەڵ کارەکەدا دەردەکەوێت و بـە پێـی ئـەم یاسایانەی خوارەوە:

گ.ك ⟸ بەرکار + ڕەگ + کات + جێناوی لکاو (کەس و ژمارە)

وەك:

| | |
|---|---|
| من ژنەگەی ئیوە دیم. | من ژنەکەی ئێوەم دیت. |
| راوێژ خانگەگەی فروش. | راوێژ خانووەکەی فرۆشت. |
| ئوان زەویگە کالێن. | ئەوان زەویەکەیان کێڵا. |

ئوان زەویگە کالێن.



هەندێك ڕستە لە (ش. ز)ەكەدا ناتوانێت پشت بە پێكهێنەری گرێی ناوی وگرێی كاری ببەستێت بۆ تەواوكردنی، بۆیە گرێی بەند وەك پێكهێنەرێكی سەرەكی بەشداری دەكات و شوێنی تایبەتی دەبێت لە ڕستەكەدا.

دەتوانین ئەم یاسایە بۆ دابرێژین:

گ. ك ⟸ گ. بەند + رەگ + كات + جێناو

كوتەگ لە وە هشتەوە هاتگە.




وەك:

كوتەگ لە وە هشتەوە هاتگە. كوتەك لە بە هەشتەوە هاتووە.

لە گرێی كاریدا كاری (بوین) و (هەبوین) كە بەرامبەرەكەی لە (ش. ك.خ)دا (بوون) و (هەبوون)ە، بوونی ئەم كارە پێویستی بە تەواوكەر هەیە لە ڕستەدا، تەواوكەرەكانیش وەكو (ناو، ئاوەڵناو،...تاد)، دەكەوێتە پێش گرێ كارییەكە.

گ. ك (بوین)، (هەبوین) ⟸ تەواوكەر + ك (بوین)، (هەبوین) + كات + جێناو لكاو

وەك:

ڕاوێژ قەڵەمەگەی گوم بوی. ڕاوێژ قەڵەمەکەی وون بوو.

من قەڵەم هەسم.من قەڵەمم هەیە .

من زانا بویم.     من زانا بووم.

ئیمە زانا بویمن. ئێمە زانا بووین.

من هەم.من هەم.

من قەڵەم هەسم




## ٢-٥-٤ ٢- ڕۆنانی دەرەوی گرێی کاری:

گرێی کاری لە فراوانکردنیدا بە بەراورد لەگەڵ گرێی ناویدا فراوانترە، چونکە گرێی نـاوی و گرێیەکانی تریش هەندێ جار دەبنە بەشێك لە گرێ کاریەکە، واتە ئەم گرێیانــە دەگەرێنــەوە بۆ گرێی کاری، لەگــەڵ ئەوەشــدا بەکەرەســتەیەکی ناســەرەکی (لاوەکــی) دادەنــرێن، چــونکە لابردنیان هیچ لە ڕۆنانی ڕستەکە کەم و زیاد ناکات.

هەوڵ دەدەین نمونەی ئەو کەرستە ناسەرەکیانە لە ڕستەدا بخەینە روو کە دەبنە بەشـێك لـە گرێی کاری، بەڵام خۆمان لە دووبارە پێداچوونەوەی گرێیەکان (کەرستەکان) دەپارێزین، چونکە هەریەکەیان بە جیا لێیان دواوین.

### ١- گرێی ناوی:

گرێی ناوی: گرێی ناوی بەشداری لە فراوانکردنی گرێــی کــاری دەکــات و ئــەرکی بــەرکار دەبینێت لە ڕستەدا دەتوانین ئەم یاسای بۆ دابرێژین:

گ.ك ⟸ گ. ن + ك

وەك:

گەشبین ئیمە چری. گەشبین ئێمەی بانگ کرد.

ئاوات ئەنارەگەی خوەرد. ئاوات هەنارەکەی خوارد.

ڕاوێژ کتاوەگان فریەتێد [٦٦]. ڕاوێژ کتێبەکان دەفرۆشێت.

گەشبین ئیمە چری




٦٦- لە (ش. ز. ف ) ی هەر دوو چاوگی (فریەتن) و (فروشتن) بەرامبەر بە (فرۆشتن)ی (ز. ك. خ) بەکاردێت، ئێمە لە رستەدا هەر دوو جۆرەکەمان بەکار هێناوە.

گرێی ناوی لە (ش. ز)ەکەدا بە پێی یاسای فراوان بوونی گرێی ناوی وەك باسمان کرد دەتوانێت لە ناو خۆیدا فراوان بێت هەموو فراوان کردنەکەش دەگەرێتەوە بۆ گرێ کاریەکە.

وەك:

ئاوات ئەنارە فرە تورشەکەی خوەرد. ئاوات هەنارە زۆر ترشەکەی خوارد.

ڕاوێژ بزنە شاخ دریژەکەی فروش. ڕاوێژ بزنە قۆچ درێژەکەی فرۆشت.

ئاوات ئەنارە فرە تورشەکەی خوەرد




**٢ - گرێی ئاوەڵناوی:**

گرێی ئاوەڵناوی لە فراوانکردنی گرێی کاریدا بەشداری دەکات، وە پانتایەکی گەورەی لە ڕستەی کوردی (ش. ز. ف) هەیەو بەشێك لە گرێی کاری.

دەتوانین ئەم یاسایەی بۆ دارێژین:

گ. ك ⟸ گ. ئاو + گ.ك

وەك:

زمسان فره سەردە.    زستان زۆر ساردە.

راوێژ کەمێگ زانایە.راوێژ کەمێك زانایە.

ئەنار فره خوەشە.    هەنار فره خۆشە.

زمسان فره سەردبوی




به پێ ی یاساکانی فراوانکردنی گرێی ئاوەڵناوی، دەتوانین ئەم گرێ ئاوەڵناویانە فـراوان بکەین، هەموو فراوانکردنەکەش هەر بەشێك دەبێت لە گرێی کاری ڕستەکە.

وەك:

زمسان فره سەردە.    زستان زۆر ساردە.

زمسان فره فره سەردە.    زستان زۆر زۆر ساردە.

راوێژ کەمێگ زانایە. راوێژ کەمێك زانایە.

راوێژ کەمێگ کەمێگ زانایە. راوێژ کەمێك کەمێك زانایە.

زمسان فره فره سەرد بوی




**٣- گرێی بەند:**

دەشێت گرێی بەند وەکو کەرەسەیەکی سەرەکی و ناسەرەکی بەشداری لە فراوانکردنی ڕۆنانی دەرەوەی گرێی کاری بکات، ئەرکی ئاوەڵکار لە ڕستەدا ببینێت.

بەم شێوەی لای خوارەوە:

أ- گرێی بەند: دەتوانێت وەکو کەرەسەیەکی ناسەرەکی لە پێش گرێی کاربێت و گرێ کاریەکە فراوان بکات.

دەتوانین ئەم یاسایەی بۆ دارێژین:

گ.ك ⟵ گ.بەند + گ.ك

وەك:

راوێژ لە باغەکەدا خەفت.     راوێژ لە باخەکەدا نووست.

چاوان ئەڕا شار چگە.چاوان بۆ شار چووە.

گەشبین لە ئاوایی کەفت. گەشبین لە دێ کەوت.

راوێژ لە باغەکەدا خەفت.




ب - گرێی بەند دەتوانێت وەکو کەرەسەیەکی سەرەکی لە دواوە بەشدری لە فراوان کردنی گرێی کاری بکات.

دەتوانین ئەم یاسایەی بۆ داریژین:

گ.ك ⟸ ك + گ.بەند

وەك:

راوێژ بوی وە ماموسا. راوێژ بوو بە مامۆستا.

کوڕەگە بوی وە پیاگ. کوڕەکە بوو بە پیاو.

راوێژ بوی وە ماموسا



دەشێت گرێی کاری لە گرێی بەند و گرێی ئاوەڵناوی و گرێی کاری پێك بێت.
دەتوانیین ئەم یاسایەیی بۆ داڕێژین:

گ.ك ⇐ گ.بەند + گ.ئا + گ.ك (کاری بوین)

وەك:

ئەو لە شار ڕەنگین بوی. ئەو لە شار جوان بوو.

من لە ئاوایی گەورە بویم. من لە ئاوای گەورە بووم.

ئوان وەنان قەڵەو بوین. ئەوان بە نان قەڵەو بوون.

ئەو لە شار ڕەنگین بوی




## ٤- ئاوەڵکار:

ئاوەڵکار بە هەموو جۆرەکانیەوە (کاتی، شوێنی، چۆنیەتی، هۆیی،...تاد) دەتوانێ لە فراوانکردنی گرێی کاری بەشداری بکات وەك کەرەستەیەکی ناسەرەکی دەردەکەوێت لە ڕستەدا، چونکە لابردنی هیچ لە واتا ڕستەکە ناگۆڕێت. تاکە نیشانەی جیاکردنەوەی ئاوەڵکار لە

بەشەکانی تری ئاخاوتن ئەو ڕۆڵەیە کە لە ڕستە دەیبینێت، بەواتایەکی تر ڕستە قالبی بۆ دادەڕێژێت [٦٧].

گ.ك ⇐ ئاوەڵكار + گ.ك

وەك :

راوێژ شەوەکی هات. راوێژ بەیانی هات.

گوڵەگە دویکە دەمی کر.گوڵەکە دوێنێ پشکووت.

چاوان دیر هات.چاوان درەنگ هات.

ئاوات ئیوارە خەفت.ئاوات ئێوارە نووست.

راوێژ شەوەکی هات




ئەم یاسایە شێوەیەکی گشتی لەخۆی دەگرێت بۆ ئاوەڵكار ئەگەری گۆڕانی کەرستەکانی ناو ڕستەکە هەیە، واتە گریٚ ئاوەڵكاریش وەك هەریەك لەو کەرستانەی ناو چوارچێوەی ڕستەکە دەتوانێت جێگۆرکێ بکات.

٦٧- یوسف شریف سعید، کاری لێکدراو لە کوردی و فارسی - لێکۆڵینەوەیەکی بەراودکاری، ١٩٩٨ : ٢٤ .

چاوان دیر هات.چاوان درەنگ هات.

دیر چاوان هات. درەنگ چاوان هات.

ئاوات ئیوارە خەفت. ئاوات ئێوارە نووست.

ئیوارە ئاوات هات. ئێوارە ئاوات هات.

**٣-١-١ ٣- گرێی ئاوەڵناوی:**

گرێی ئاوەڵناوی: مەبەست لە گرێی ئاوەڵناوی ئەو گرێیەیە کەدەبیت کەرتی بنەرەتی ئاوەڵناو بیت، واتە بێ بوونی ئاوەڵناو گرێی ئاوەڵناوی درووست نابێت [٦٨].

**٣-١-٢ ڕۆنانی گرێی ئاوەڵناوی:**

گرێی ئاوەڵناوی لە ڕووی پێکهاتەوە زۆر سادەیە، بەتایبەتی ئەگەر لەگەڵ گرێی ناوی بەراوردی بکەین، دەشێت گرێی ئاوەڵناوی بەسێ شێوە فراوان بکرێت:

١- فراوانکردنی گرێی ئاوەڵناوی لە پێشەوە.

٢- فراوانکردنی گرێی ئاوەڵناوی لە دواوە.

٣- فراوانکردنی گرێی ئاوەڵناوی لە هەردولاوە (دواوە و پێشەوە).

**٣-١-٣ ١- فراوانکردنی گرێی ئاوەڵناوی لە پێشەوە:**

گرێی ئاوەڵناوی لە پێشەوە فراوان دەبیت بەیارمەتی (رادە) بەتایبەتی (فرە، تەمام، ئەوقەرە، کەمێگ ، بڕێ)

دەتوانین ئەم یاسایەی بۆ دابڕێژین:

گ.ئا ⟸ رادە + ئاوەڵناو

---

٦٨- ئاواز حەمە صدیق، ١٩٩٦ : ٤٠

وەك:

کوڕەگە فرە زاناس.    کوڕەکە زۆر زانایە.

ئەو قەرە شیرین بوینەکروژیەی.  ئەوەندە شرین بیت، نەکرۆژرێی.

ژنەگە تەمام هیلاگ بووی.            ژنەکە تەواو ماندوو بوو.

دەتوانین گرێی ئاوەڵناوی فراوان بکەین بە یارمەتی دووبارە کردنەوەی رادە لەم ڕستانەی سەرەوەدا گرێی ئاوەڵناوی بەیارمەتی وەرگرتنی (رادە) لە پێشەوە فراوان کراوە، کە هەموو رادەکانیش دەبنە دیارخەری پێشەوەی سەرەی گرێی ئاوەڵناویەکان، واتە بێ بوونی (رادە) گرێی ئاوەڵناوی لەپێشەوە فراوان نابێت.

وەك:

کوڕەگە فرە فرە زاناس.            کوڕە زۆر زۆر زانایە .

ژنەگە تەمام تەمام هیلاگ بوی .       ژنەکە تەواو تەواو ماندوو بوو.

کوڕەگە فرە فرە زانایە



## ٣-١-٤    ٢- فراوانكردنی گرێی ئاوەڵناوی لە دواوە:

گرێی ئاوەڵناوی لەدواوە تەنها بە یارمەتی وەرگرتنی مۆرفیمەكانی پلەی بەراورد و پلەی باڵا فراوان دەبیت ئەوانیش بریتین لە (تر) و (ترین).

گرێی ئاوەڵناوی لە پلەی بەراورد دا بەم شێوەیە درووست دەبێت:

گ.ئاو ⇐ ئاوەڵناو + مۆرفیمی (تر) ی پلەی بەراورد

وەك:

خاس + تر ← خاستر

گەرم + تر ← گەرمتر

چەرمگ + تر ← چەرمگترە

خوەش + تر ← خوەشتر

وەك:

ڕاوێژ لە گەشبین خاسترە. ڕاوێژ لە گەشبین باشترە.

تاوسان لە وەهار گەرمترە. هاوین لە بەهار گەرمترە

ئەنار لە ئەنگویر خوەشترە. هەنار لە ترێ خۆشترە.

لەم ڕستانەدا هەموو ئاوەڵناوەكانی (خاس، گەرم، خوەش) بە یارمەتی مۆرفیمی (تر)، گرێی ئاوەڵناویان درووست كردووە، واتە (خاس، گەرم ، خوەش) بوونەتە سەرەی (گرێ) كان مۆرفیمی (تر) ش بوو بە دیارخەری دواوەی سەرەی ئاوەڵناوەكان.

وەك:

ڕاوێژ لەگەشبین خاسترە.

(د.د) (س)

تاوسان لە وەهار گەرمترە.

(د.د) (س)

گرێی ئاوەڵناوی لە پلەی باڵادا بەم شێوەیە دروست دەبێت:

گ.ئا ⇐ ئاوەڵناو + مۆرفیمی (ترین)ی پلەی باڵا

خاس + (ترین) ← خاسترین

گەرم + (ترین) ← گەرمترین

چەرمگ + (ترین) ← چەرمگترین

خوەش + (ترین) ← خوەشترین

وەك:

ڕاوێژ خاسترین کوڕە. راوێژ باشترین کوڕە.

کەرکوك خوەشترین شارە. کەرکوك خۆشترین شارە.

هەولێر ڕەنگینترین شارە. هەولێر جوانترین شارە.

لەم ڕستانە هەموو ئاوەڵناوەکانی (خاس، خوەش، ڕەنگین ) بە یارمەتی مۆرفیمی (ترین) گرێی ئاوەڵناویان لە پلەی باڵا دروست کردووە، واتە (خاس، خوەش، ڕەنگین) سەرەی گرێیەکانن و مۆرفیمی (ترین) بووە بە دیارخەری دواوەی سەرەی گرێیەکان، واتە مۆرفیمی(ترین) لە پلەی باڵا وەکو مۆرفیمی (تر)ی پلەی بەراورد لە دواوە گرێی ئاوەڵناوی فراوان دەکات

وەك:

ڕاوێژ خاسترین کوڕە.

( س ) ( د.د )

کەرکوك خوەشترین شارە.

( س ) ( د.د )

دەبێ تێبینی ئەوە بکەین، کە مۆرفیمی (تر)ی پلەی بەراورد و (ترین)ی پلەی باڵا لەگەڵ یەکتردا هەرگیز بەیەکەوە لەگرێیەکدا دەرناکەون.

جێگای سەرنجە (بەکر عومەر و ئاواز صدیق) دەڵێن : ئاوەڵناو لە پلەی باڵا دا گرێی ئاوەڵناوی فراوان ناکات، چونکە دەبێت لەگەڵ پلەی باڵا دا سەرەی گرێیەکە ناوبێت[٦٩].

بە بڕوای ئێمە ئاوەڵناو لە پلەی باڵا دا زۆر بە ئاسایی گرێی ئاوەڵناوی فراوان دەکات.

وەك: (خاس، خوەش، گەرم، شرین،.... تاد).

ئەم وشانە ئاوەڵناون کاتێك مۆرفیمی (ترین)ی پلەی باڵا یان دەخەینە سەر ڕاستەوخۆ دەبنە گرێی ئاوەڵناوی وەك (خاسترین، خوەشترین، گەرمترین، شرینترین،.... تاد)، واتە مۆرفیمی (ترین) بووە بە دیارخەری دواوەی سەرەی ئاوەڵناوەکان و گرێی ئاوەڵناوی پێ فراوان کراوە نەك گرێی ناوی.

وەك:

| | |
|---|---|
| خاسترین کوڕ هات. | باشترین کور هات. |
| خوەشترین شار کەرکوکە. | خۆشترین شار کەرکوکە. |

لەم ڕستانە (خاس + ترین)، (خوەش + ترین)، واتە ئاوەڵناو لەگەڵ مۆرفیمی (ترین) بەیەکەوە گرێیەکی ئاوەڵناوی پێکهێناوە، ئەم گرێیانەش وەك یەکەیەکی سینتاکسی دەبنەدیارخەری پێشەوەی گرێی ناوی، واتە (خاسترین و خوەشترین) دیارخەری پێشەوەی سەرەی گرێی ناوی (کوڕ) و (شار) ن.

خاسترین کوڕ هات.



(د.پ) (س)

---

٦٩- بروانە ئەم سەرچاوانەی خوارەوە:

أ- بەکر عومەر عەلی، بەستن و کرتاندن لە کوردیدا، ١٩٩٢: ٦٧

ب- ئاواز حەمە صدیق ١٩٦٦ : ٤١

خوەشترین شار

(د.پ) (س)

**٣-١-٥ ٣- فراوانکردنی گرێی ئاوەڵناوی لە هەردوولاوە (پێشەوە و دواوە):**

جگە لەو دوو خاڵەی باسمان کرد دەتوانرێت لە دواوە و پێشەوە گرێی ئاوەڵناوی فـراوان بکرێت لە پێشەوە (ڕادە) بەشـدار دەبێـت لـە فراوانکردنـی گرێـی ئاوەڵناویەکـە لـەدواوەش مۆرفیمی (تر)ی پلەی بەراورد.

وەك:

ڕاوێژ فرە خاسترە لە چاوان.ڕاوێژ زۆر باشترە لە چاوان.

کەرکوك کەمێگ گەرمترە لە هەولێر.کەرکوك کەمێك گەرمترە لە هەولێر.

ژن تەمام هیلاگ ترە لە پیاگ. ژن تەواو ماندووترە لە پیاو.

لەم ڕستانەی سەرەوەدا گرێی ئاوەڵناوی لە هەردوولاوە بەدیارخەر فراوانکـراوە، دیارخـەری پێش گرێیەکان بریتیە لـە (ڕادە) وە دیارخـەری دواوەش بریتیـە لـە مـۆرفیمی (تـر)ی پلـەی بەراورد، واتە هەریەك لە (خاس، گـەرم، هـیلاك) سـەرەن بـۆ گرێـی ئاوەڵناویەکـە، (ڕادە) و مۆرفیمی (تر) دیارخەری پێشەوە و دواوەی گرێیەکەن.

وەك

ڕاێژ فرە خاسترە لە چاوان.

کەرکوك کەمێگ گەرمترە لە هەولێر.

ڕواێژ فرە خاسترە لە چاوان.

(د.پ) (س) (د.د)

کەرکوك کەمێگ گەرمترە لە هەولێر.

(د.پ) (س) (د.د)

دەتوانین دیارخەری پێش (سـەرە) زیـاد بکـەین بـە یارمـەتی دووبارەبوونـەوەی (ڕادە) وە هەموو زیاد کردنەکەش بە سەریەکەوە دەبێتە یەك دیارخەر بۆ سەرەی گرێی ئاوەڵناویەکە.

وەك:

ڕایژ فره فره خاستره له چاوان.

(د.پ) (د.پ) (س) (د.د)

کەرکوك کەمێگ کەمێگ گەرمترە لە هەولێر.

(د.پ) (د.پ) (س) (د.د)

لە ڕستەکانی سەرەوەدا ئەوە بەدی دەکەین لە (ش. ز. ف)دا بـەهیچ شـێوەیەك ڕێگـا بـە دووبارە بوونەوە یـان زیـادکردنی دیارخـەری دوای سـەرە نادرێـت، چ بـە دووبـارە بوونـەوەی مۆرفیمی (تر)ی پلەی بەراورد یان زیادکردنی (ڕادە) لەدوای سەرەی گرێـی ئاوەڵناویـەکان، جا ئەو زیادکردنە لە پێش مۆرفیمی (تر) یان لەدوای مۆرفیمی (تر) بێت.

ئەوەی جێگای سەرنجە لەم جۆرە گرێیەدا مۆرفیمی (ترین) ی پلەی بـالاَ بـەهیچ شـێوەیەك ناتوانێت بەشداری لە فراونکردنی ئەم گرێیەدا بکات، چونکە مۆرفیمی (تـرین) ی پلـەی بـالاَ کاتێك دەبێتە دیارخەری دوای سەرەکە تەنها خۆی لە گرێیەکـەدا دەرکـەوێت، واتـە هـەرگیز مۆرفیمی (ترین) وەك دیارخەری دوای سەرەو (ڕادە) وەك دیارخەری پێش سەرە بەیەکـەوە لـە گرێیەکدا دەرناکەون.

وەك:

ڕاوێژ فره ڕەنگینترین هات. ❊      راوێژ زۆر جوانترین هات.❊

ڕاوێژ فره فره ڕەنگینترین هات. ❊      راوێژ زۆر زۆر جوانترین هات. ❊

جێگای سەرنجە (رادە) وەکو دیارخەری پێش سەرەی گرێی ئاوەڵناوی لە پلـەی بـەراورد و لە پلەی باڵا دا دەتوانێت جێگای خۆی جێ بهێڵێت و بکەوێتە پێش گرێی ناوی.

وەك:

| | |
|---|---|
| ڕاویێژ فرە خاسترە لە چاوان. | راوێژ زۆر باشترە لە چاوان. |
| فرە ڕاوێژ خاسترە لە چاوان. | زۆر راوێژ باشترە لە چاوان. |
| ڕاوێژفرە فرە خاسترە لە چاوان. | راوێژ زۆر زۆر باشترە لە چاوان. |
| فرە فرەڕاوێژ خاسترە لە چاوان. | زۆر زۆر راوێژ باشترە لە چاوان. |
| کەرکوك کەمێگ گەرمترە لە هەولێر. | کەرکوك کەمیێك گەرمترە لە هەولێر. |
| کەمێگ کەرکوك گەرمترە لە هەولێر. | کەمیێك کەرکوك گەرمترە لە هەولێر. |
| کەرکوك کەمێگ کەمێگ گەرمترە لە هەولێر. | کەرکوك کەمیێك کەمیێك گەرمترە لە هەولێر. |
| کەمێگ کەمێگ کەرکوك گەرمترە لە هەولێر. | کەمیێك کەمیێك کەرکوك گەرمترە لە هەولێر. |

ئەو دیارخەرانەی، کە جێگای خۆیان جـێ دەهـێلن و دەکەونـە پـێش گرێـی نـاوی، واتـە سەرەتای ڕستە بە هەمان رادە فـراوان بکـرێن، هـەموو فراوانکردنەکـەش بـۆ سـەرەی گرێـی ئاوڵناویە.

وەك:

| | |
|---|---|
| فرە ڕاوێژ خاسترە لە چاوان. | زۆر ڕاوێژ باشترە لە چاوان. |
| فرە فرە ڕاوێژ خاسترە لە چاوان. | زۆر زۆر ڕاوێژ باشترە لە چاوان. |
| کەمێگ کەرکوك گەرمترە لە هەولێر. | کەمێك کەرکوك گەرمترە لە هەولێر. |
| کەمێگ کەمێگ کەرکوك گەرمترە لە هەولێر. | کەمێك کەمێك کـەرکوك گـەرمترە لـە هەولێر. |

**٤-١-١ ٤- گرێی بەند:**

((گرێی بەند جۆرێکی ترە لەو گرێیە کە تیگۆرییانەی کە خاوەن تایبەتی خۆیەتی لە هەر زمانێکدا [٧٠])).

لە گرێی بەندا هەمیشە دەبێ ئامرازی بەند بوونی هەبێ و ئەو ئامرازانە دەبنە سەرەی گرێیەکە بۆیە بە پێویستی دەزانین بەر لە پێکهاتەی گرێی بەند بە کورتی باس لە ئامرازی بەند بکەین لە (ش. ز. ف)دا.

**ئامرازی بەند:**

ئامرازەکانی گرێی بەند لە (ش. ز. ف)دا بریتین لە دووجۆر:

١- ئەوانەی یەک مۆرفیمن و لە پێش وشەی واتادار دێن، پێیان دەڵێین (ئامرازی بەندی سادە).

وەك:

(لە، ئەڕا، وە).

٢- ئەو ئامرازانەی لە مۆرفیمێك زیاتر پێك دێن و دەکەونە پێش و دوای وشەی واتادار، پێیان دەڵێین ئامرازی بەندی کەرتی.

وەك:

(لە...دا، لە....وە، وە......وە).

دەشێت شێوەی دارشتنی گرێی بەند بە چەند یاسایەك بخەینە ڕوو:

**٤-١-٢١- درووست کردنی گرێی بەند بە ئامرازی بەندی سادە:**

سادەترین گرێی ناوی بە یارمەتی ئامرازی بەند گرێی بەند درووست دەکات

گ. ⇦ بەندئامرازی بەند + گ.ن

وەك:

راوێژ وە دار مارەگەی کوش. راوێژ بە دار مارەکەی کوشت.

گەشبین وە پویل کتاوەگەی فروش. گەشبین بە پارە کتێبەکەی فرۆشت.

---

٧٠- صباح رشید قادر ٢٠٠٧ : ٤٤ .

باران لە سایاقا نیە واریٚ.　　　باران لە سایەقە ناباریٚ.

ئەسارە لە ئاسمان نماگە.　　　ئەستێرە لە ئاسمان نماوە.

پیاگ ئەڕا ریش چوگ سێولێش ناوبانی.　　　پیاو بۆ ریش چوو سمێڵشی لە سەردانا.

ئەسارە لە ئاسمان نماگە




گرێی بەند لە گرێی ناوی و ئامرازی بەند درووست دەبێت، ئەگەر گرێی ناوییە کە بە (رادە، جێناوی پرس، جێناوی نەفی ،.. تاد)، فراوان کرابێت ئەوا بە یارمەتی ئامرازی بەند گرێی بەند درووست دەکەن، هەرچەندە گریٚ ناویەکە فراوان بکرێت، بە ئامرازی بەند دەبێتە گرێی بەند.

گ.بەند ⟸ ئامرازی بەند + گ.ن (فراوانکراو)

وەك:

| | |
|---|---|
| وە دو ژن شارێگ ئەرمیٚ. | بەدوو ژن شارێك دەرووخیٚ. |
| لە سەد ژن ژنێگ هات. | لە سەت ژن ژنێك هات. |
| لە چەند شار فروشریاگە. | لە چەند شار فرۆشراوە. |

### ٤-١-٣ ٢- درووست کردنی گرێی بەند بەئامرازی بەندی کەرتی:

گرێی بەند لە (ش. ز. ف)، بە یارمەتی ئامرازی بەندی کەرتی درووست دەبێت.

گ.بەند ⇦ کەرتی پێشەو + گ.ن + کەرتی دواوە

وەك:

| | |
|---|---|
| چاوان لەباغەگەدا خەفت؟ | چاوان لە باخەکەدا نووست؟ |
| لە منەوە تا ئیوە هەفتین. | لە منەوە هەتا ئێوە حەوتین. |
| کوتەك لە وەهشتەوە هاتگە. | کوتەك لە بەهشتەوە هاتووە. |
| لەبانەوە کوڕەگە هات. | لە سەرەوە کوڕەکە هات. |
| وەئاسمانەوە ئەسارە نماگە. | بە ئاسمانەوە ئەستێرە نەماوە. |
| لە پەنجەوە میەگان حساوکردم. | لە پێنحەوە مەرەکانم ژمارد. |
| گورگ و میە وەیەکەوە ئاوخوەن. | گورگ و مەر بەیەکەوە ئاودەخۆن ؟؟ (گورگ و مەر بەیەکەوە ئاو دەخۆنەوە.) |

لەم گریٚ بەندە دەتوانرێت کەرتی دواوە لابدرێت:

گ.بەند ⇦ کەرتی پێشەو + گ.ن

وەك:

| | |
|---|---|
| چاوان لەباغەگەدا خەفت؟ | چاوان لە باخەکەدا نووست؟ |
| چاوان لەباغەگە خەفت؟ | چاوان لە باخەکە نووست؟ |
| لە منەوە تا ئیوە هەفتین. | لە منەوە هەتا ئێوە حەوتین. |
| لە من تا ئیوە هەفتین. | لە من هەتا ئێوە حەوتین. |
| کوتەك لە وەهشتەوە هاتگە. | کوتەك لە بەهشتەوە هاتووە. |
| کوتەك لە وەهشت هاتگە. | کوتەك لە بەهشت هاتووە. |

# بەشی سێیەم

## ١-٥ ڕستە و جۆرەکانی ڕستە لە ڕووی ڕۆنانەوە:

### ٥-٢ پێناسەی ڕستە :

ڕستە لە زمانی کوردی دا زۆر پێناسەی جیاوازی بۆ کراوە هەر ڕێزمان نووسە لە ڕوانگـەی تێگەیشتن و ڕێبازە زمانەوانی یەکەی پێناسەی کردووە ، لە ڕوانگـەی ڕێبـازی ڕێزمـانی کـۆن (ڕێزمانی دێرین) پێناسەی ڕستەیان کردووە ، تیشکیان خستوتە سەر لایەنی واتای ڕستە نـەك (ئەرك و ڕۆنان) .

ئێمە لە ناو هەموو پێناسەکان ئەو پێناسەیە بە پەسـەند دەزانـیین لـە ڕوانگـەی ڕۆنانـەوە دەڕوانێتە ڕستە و ڕستە بە گەورەترین دانەی ئاستی ڕستەسـازی دادەنێت.((ڕسـتە گـەورەترین دانەی زمانە لە ڕووی ڕۆنانەوە سەربەخۆبێت))[٧١] .

چاکی ئەم پێناسەیە لەوە دایە ، کە چارەسەری گرفتی ڕستەی نسادە دەکات ، هەر چـەندە لە ڕێزمانی بەرهەم هێنان و گوێزانەوەدا ڕستە واپێناسە دەکرێ ، کە ڕستە لـە گرێـی نـاوی و گرێی کاری پێك دێت . بەم پێیە دان بە ڕستەی ئـاڵۆزدا نانێـت ، چـونکە لـە ڕوانگـەی ئـەم ڕێزمانەوە ڕستەی لێکدراو و ئاڵۆز لە ڕۆنانی ژێرەوەیان دا دوو ڕستەی سادە یـان زیـاترن و لـە ڕۆنانی سەرەوەدا لێکدراون ، بەواتایەکی تر لە ڕوانگەی ڕێزمـانی بەرهـەم هێنـان دا ڕسـتەی سادە دۆخێکی ڕۆنانی نییە ، بەڵکو دۆخی گواستنەوەیە و بەندە بە ڕێزمـانی گوێزانـەوە نـەك بەرهەم هێنان[٧٢] .

### ٥-٣ جۆرەکانی ڕستە:

١- ڕستەی سادە

٢- ڕستەی لێکدراو

٣- ڕستەی ئاڵۆز

---

٧١- محمد معروف فتاح ، زمانەوانی ، ١٩٩٠ : ٩٨

٧٢- هەرچەندە لەم کارەدا پشتمان بە ڕوانگەی بەرهەم هێنان بە ستووە لێرەدا بەپێویستی دەزانیین بۆ روون کردنەوەی هەندێ لایەنی ڕێزمانی شێوە زارەکە سوود لە بنەمای ڕۆنانکاریەکانیش وەربگرین.

## ٤-٥ ڕستەی سادە (simple sentence):

سادەترین ڕستە لە (ش . ز . ف )دا لە گرێیەکی ناوی و گرێیەکی کاری پێك دێت .

وەك:

| | |
|---|---|
| چاوان خەفت . | چاوان نووست . |
| ئەو کەفت . | ئەو کەوت . |
| کەموتر باڵ گرد . | کۆتر فری . |
| راوێژ دوێکە لە شار خەفت . | راوێژ دوێنێ لە شار نووست . |
| هەر گەشبین شەوەکی هات . | هەر گەشبین بەیانی هات . |
| تەنیا ئەو دو گوڵە رەنگینە وە پا هاتن . | تەنها ئەو دوو گوڵە جوانە بە پێ هاتن . |

چاوان خەفت




لەبەرئەوەی پێشتر بە یارمەتی جۆرەکانی گرێ، باسمان لە فراوان کردنی ڕستە کردووە بۆیە بە پێویستی نازانین دووبارە بەسەریاندا بچینەوە .

**٥-٥-١ ٢- ڕستەی لێکدراو :**

**٥-٥-٢ پێناسەی ڕستەی لێکدراو :**

**ڕستەی لێکدراو:** (( ڕستەییێکە لە دوو یان پتر لە ڕستە پێکهاتووە ، کەبەیارمەتی ئامرازی تایبەت بە یەکەوە بەستراونەتەوە و لکاون گەیشتونەتە یەکتر[٧٣].))

**ڕستەی لێکدراو:** (( ئەو ڕستەیە کەلە دوو ڕستە وەیا زێتر پێك دێت بە هۆی ئامرازی لێکدەرەوە. ئەو ڕستانەی بەشداری ڕستەی لێکدراو دەکەن لەهەمان بارو ڕادەی سینتاکسی دان و خاوەنی هەمان پلەی سەربەخۆیین[٧٤] .))

**ڕستەی لێکدراو:** (( ئەو ڕستەیە ، کەلە دوو ڕستەی سادە یان زۆرتر پێك دێت بە پێی پێویست، هەریەك لە ڕستە سادەکان ڕستەی سەربەخۆن لە هەموو بارێکەوە (سینتاکسی، واتایی....) ئامرازە لێکدەرکانیش ڕۆڵێکی ئاشکرا دەبینن، لە پێکەوە بەستنەوەی ڕستە سادەکان[٧٥]. ))

**ڕستەی لێکدراو:** (( ئەو ڕستەیەیە کە لە ئەنجامی لێکدانی دوو ڕستە یان زیاتر درووست دەبێت، ئامرازی لێکدەر بەشەکانی بەیەکەوە دەبەستێتەوە، هەر ڕستەیەك وەك ڕستەیەکی سەربەخۆ و پڕ لە ڕووی ڕێزمانەوە ڕەفتار دەکات و ئامرازەکە ناچێتە ناو دارشتنی رستەکە، بەڵکو تەنیا ڕستەکان بەیەکەوە دەبەستێتەوە[٧٦]. ))

**٥-٥-٣ درووست کردنی ڕستەی لێکدراو:**

لە ڕووی ژمارەی ڕستەکانەوە بە یارمەتی ژمارەی گرێی کاری لە ڕستەکەدا دیاری دەکرێت، واتە چەند گرێی کاری لە رستەکەدا هەبێت ئەوەندە ڕستەی سادە لە ڕستە

---

٧٣- د. ابراهیم عزیز ابراهیم ، ڕستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخواز لەگەڵ ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری لە دیالێکتە ناوەندی یەکانی زمانی کوردی دا ، ١٩٨٠ : ١٩١

٧٤- د. کوردستان موکریانی ، سینتاکسی ڕستەی سادە لە زمانی کوردی دا ، ١٩٨٦ : ٧١

٧٥- عەبدوڵڵا حوسێن ڕەسول ، ناکردن لە کوردیدا ، ١٩٩١ : ٦٦

٧٦- شلێر ڕەسول محەمەد ، یاساکانی دارشتنی لاڕستەی دیارخەری لە زمانی کوردیدا ، ٢٠٠٤ : ٣٨-٣٩

لێکدراوەکەدا هەیە. هەرچەندە ئەم تێروانینە بۆ ڕستەی لێکدراو دەبێتە هۆی تێکەڵی لە دەست نیشانکردنی جۆرەکانی ڕستە لە ڕووی ڕۆنانەوە[٧٧] .

### ٥-٥-٤ دروست کردنی ڕستەی لێکدراو بە یارمەتی مۆرفیمی لێکدەر:

مۆرفیمی لێکدەر دوو ڕستەی سادە بە یەکەوە دەبەستێتەوە و ناکەوێتە ناو سنووری هیچ کامێك لە ڕستە سادەکان [٧٨] .

لە ( ش . ز . ف )دا کۆمەڵێك مۆرفیمی لێکدەری وەك ( و ، تا ، نە ، نەك ، وەلی ، بەس ...تاد ) هەیە کە ئەرکی پێکەوە گرێدانی ڕستەکان دەگێڕن.

وەك :

### ١- مۆرفیمی لێکدەری ( و )

وەك:

شا مردگە و شاگەردانە.            شا مردووە و شاگەردانە . (گە.ئەڵ،ل١٤٢)

ماگا مرد و بیرە بڕیا .            مانگا مرد و دۆ بڕا .

ئویشی سیڤێگن و بویە وە دوکوتەوە.            دەڵێی سێوێکن و بووە بە دوو کەرتەوە .

ماگا مرد و بیرەبڕیا




---

٧٧- ( س. پ ): ٣٩

٧٨- دەشێت لە نێوان ڕستەکان وێرگوڵ دابنرێت وەك پێویستیەکی نووسین.

### ٦- مۆرفیمی لێكدەری ( تا )

وەك :

راوێژ نیشت تا چاوان هات.      راوێژ دانیشت تا چاوان هات .

نان نەخوەردم تا كارگەریەل نەهاتن.      نانم نە خوارد تا كرێكارەكان نەهاتن .

نان لە بن هەنگڵم نی یە تا سەگ بكەفێگە شوونم.      (گە. ئەلˇ، ل٢٢٣)

نان لەژێر هەنگڵم نی یە تا سەگ بكەوێتە شوێنم .

راوێژ نیشت تا چاوان هات




هەندێك جار مۆرفیمی لێكدەری ( تا ) لەسەرەتای ڕستەی لێكدراو دێت، واتە ڕستە سادەكان پێكەوە دەبەستێتەوە، یاخود بەواتایەكی تر شوێنی خۆی لەنێوان ڕستە سادەكان بەجێدەهێڵێت و دێتە سەرەتای ڕستە .

وەك:

تا مەقاش هەس ، دەس خوەت مەسزن .      تا مەقاش هەیە ، دەس خۆت مەسووتێنە .

تاگور ساڵە وە گا بوی ، جەرگ خاوەنی وە ئاو بوی .

تا گۆلەك بە گا بوو ، جەرگ خاوەنی بە ئاو بوو .

تا مەقاش هەس ، دەس خوەت مەسزن.




**٣- مۆرفیمی لێکدەری ( بەس ) :**

لە هەموو مۆرفێمە لێکدەرەکان زیاتر بەکاردێت بۆ بەستنەوەی دوو ڕستەی سادە یان زیاتر تەنانەت لە (ش . ز)ەکەدا زۆر جار لە شوێنی (وەلی ،...تاد) بەکاردێت.

وەك:

قسێ هەزارە بەس دوانی وەکارە




قسێ هەزارە بەس دوانی وەکارە.
منالّەگە نەخوەشە بەس تێت .
زمسان هات بەس سەرد نەوی.

قسە هەزارە ، بەس دوانی بەکارە .
منداڵەکە نەخۆشە بەس دێت .
زستان هات بەس سارد نەبوو .

**٤- مۆرفیمی لێکدەری ( وەلی ):**

زۆر جار مـۆرفیمی لێکـدەری ( بـەس ) لـە شـوێنی ( وەلـی ) بـەکاردێت و بـرەوی ئـەم مۆرفیمەی لە بەکارهێناندا کەم کردووە.

وەك:

باغەگە رەنگینە ، وەلی بویچگە . باخەکە جوانە ، بەڵام بچووکە .

کەرکوك خوەشە ، وەلی گەرمە . کەرکوك خۆشە ، بەڵام گەرمە .

فرەخوەنیم ، وەلی سەرنەکەفتم . زۆرم خوێند ، بەڵام سەر نەکەوتم .

کەرکوك خوەشە وەلی گەرمە.




**٥- مۆرفیمی لێکدەری ( نە.....نە )[٧٩]:**

وەك:

نە تاوسان سەردە نە زمسان گەرمە. نەهاوین ساردە نە زستان گەرمە .

نە ئەڵپەرگە کەرم نە چووپی کیش. (گە.ئاڵ،ل٢٢٧).

نە شایی کەرم نە چۆپی کێشم .

نە کونە نزیك ئاوان نە دویتە نزیك باوان .

نە کوندە نزیك کانی ، نە کچ نزیك ماڵ باوان .

---

٧٩- د. ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم ، لە لاپەرەی (١٧)ی هەندێ ئامرازی سینتاکسی لە زمانی ئەدەبی ئیمـرۆی کوردیدا ، (نە) بەمۆرفیمی لێکدەر دانانێت ، بەڵکو بە جێناوی نەفی دادەنێت.

نەئەیە وەختە ، نە ئەوە وەختە . (گە.ئاڵ،ل٢٣٣)
نە ئەمە کاتە ، نە ئەوە کاتە .

نە کونە نزیك ئاوان نە دویتە نزیك باوان




**٥- مۆرفیمی لێکدەری ( نەك )**

وەك:

نان وە تیۆڵە نەك وە سێوڵە. نان بە ناوچەوانە نەك بە سمێڵە .
نان بدە وە سەگ نەك وە سفلە. (گ.ئاڵ،ل٢٢٥)
نان بدەبە سەگ نەك بە سفلە.

نان وه تیۆڵه نەك وەسێوڵە.




**٦- مۆرفیمی لێكدەری (ئەوجا):**

وەك:

قسه چی بكەرەوە ئەوجا بویشه .          (پە.ق.ن،ل٩١)

قسه جیا بكەوە ، ئینجا بیلێ .

ئاوات دەرس خوەنی ، ئەوجا هات .          ئاوات وانەی خوێند ، ئینجا هات .

فره خوەنیم ، ئەوجا سەركەفتم .          زۆرم خوێند ، ئینجا سەركەوتم .

قسه چی بكەرەوە ئەوجا بویشه



**٧- مۆرفیمی لێکدەری (ش)[٨٠].**

وەك:

من کوردم ، تنش کوردی .      من کوردم تۆش کوردی .

چاوان وەتاو هات ، ئاواتیش وەخوەشی .      چاوان بە غار هات ، ئاواتیش بەخۆشی .

زمسان سەردە ، تاوسانیش گەرمە .      زستان ساردە ، هاوینانیش گەرمە .

من کوردم  تنش کوردی




**٥-٦-١ ٣- ڕستەی** ئاڵۆز **(complex sentence):**

**٥-٦-٢ پێناسەی ڕستەی** ئاڵۆز **:**

زۆربەی ئەو سەرچاوە کوردی یانەی کە باسیان لە ڕستەی ئاڵۆزکردووە ، دیارە سەرەتا پێناسەی ڕستەی ئاڵۆز دەکەن ئێمە لێرەدا هەوڵدەدەین چەند پێناسەیەك بخەینە بەرچاو کە لە لایەن ڕێزمان نووسەکانەوە خراوەتە ڕوو بە مەبەستی یەك لاکردنەوەی خاڵی کۆك و جیاوازی نێوانیان و هەندێك لایەنی تر.

**ڕستەی تێکەڵ:** ((بەتێکەڵبوونی دوو ڕستەی لە ڕووی سینتاکسەوە جیاواز دەگوترێت، کە یەکێکیان سەرەکیە و ئەودییان شوێن کەوتووی ڕستە سەرەکێکەیە[٨١].))

---

٨٠- بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی مۆرفیمی ( ش ) بروانە ئەم سەرچاوەیە:

د. ساجیدە عەبدوڵا فەرهادی ، مۆرفیمی ( ش ) لە کوردی ناوەڕاستدا ، ٢٠٠٠ : ٨٣-٨٦

٨١- د. کوردستان موکریانی ، ١٩٨٦ : ٧٦.

**ڕستەی ئاوێتە:** (( لە دوو ڕستە (پارچە ڕستە) یـان پـتر پێـك دێـت و بەیاریـدەی وشـەی لێكدەرەوە (ڕاناوی لێكدەر، ئامرازی لێكدەر) دەدرێتە دەم یەكتر[٨٢]. ))

**ڕستەی ئاوێتە:** (( ڕستەی ئاوێتە لە دوو ڕستەی سادە یان زۆرتر پێك دێت ، بەڵام لـە نـاو ڕستە سادەكاندا یەكێكیان سەرەكیە (شارڕسـتە)یە و ئـەوانی تـر لاوەكـین (پاڕسـتە) ژمـارەی پاڕستەكانی بەپێی مەبەست و ئارەزووی قسەكەر دەگۆڕێت[٨٣]. ))

**ڕستە ئاڵۆز:** (( دەشێ ڕستەی ئاڵۆز وەك كۆمەڵـە پارسـتەیەك تێـی بڕوانـرێ، كەبـەلای كەمەوە لە ڕستەیەكی سەرە و ڕستەیەكی بەند (دیارخەر) یان چەند ڕستەیەكی دیارخـەر پێـك بێ[٨٤].))

**ڕستەی تێكەڵ:** ((لە ڕستەیەكی سەرەكی و ڕستەی شوێنكەوتوودا پێـك هـاتووە، كەهـەر یەكەیان ڕۆڵی دیاریكراوی سینتاكسی خۆیان هەیە. باری شوێنكەوتنی ڕستەی شوێنكەوتوو بە ڕستەی سەرەكییەوە بە كۆمەڵە هۆیـەكی سینتاكسـی پێوەسـتە، كـە لـە هـەمووان ئـامرازی گەیەنەرە، كەئەم ئامرازە دەچێتە نێو پێكهێنان و دارشتنی ڕستەی شوێنكەوتوو[٨٥].))

**ڕستەی ئاوێتە:** (( ڕستەی ئاوێتە یان (تێكەڵ) ئەو جۆرە ڕستە ناسادانە دەگرێتەوە، كە لە پتر لە ڕستەیەكی سادە پێك دێن و لە هەموو ڕسـتە سـادەكان تـەنیا ڕسـتەیەكیان سـەرەكیە Independent clause و ناتوانرێ لابدرێ، كە (شارستە)ی پێ دەوترێ، سەرجەم ڕسـتەكانی تر لاوەكین Dependent clause و دەتوانرێ لابدرێت ، كە (پارستە) یان پێ دەوترێ[٨٦]. ))

ئەوەی ئێمە دەمانەوێت لەم پێناسانەدا بیان خەینە ڕوو بریتی یە لە چەند خاڵێك :

١- هەندێك لە ڕێزمان نووسەكان دەڵێن ڕستەی ئـاڵۆز لـە ئـەنجامی دوو ڕسـتە ( تێكـەڵ بوون، لێكدان، پێكهاتن ) درووست دەبێت ، بەڵام مەرج نییە تەنها لە ئـەنجامی دوو ڕسـتەوە درووست بێت، لەوانەیە دوو ڕستە یان زیاتر بێت .

---

٨٢- لێژنەیەك لە وەزارەتی پەروەردە ، كتێبی زمان و ئەدەبی كوردی ، ١٩٨٩ : ١٤.

٨٣- عەبدوڵڵا حوسێن ڕەسول ، ١٩٩١ : ٨٠ .

٨٤- ساجیدە عەبدوڵڵا ، ٢٠٠٣ : ٨٧.

٨٥- د. كوردستان موكریانی، سینتاكسی ڕستەی تێكەڵ ، ٢٠٠٤ : ٥.

٨٦- د. عەبدوڵڵا حوسێن ڕەسول ، ٢٠٠٥ : ٥٢.

وەك:

چاوان لە بان دیوارەگە بازی کوتا و داوەزیە بان زەوییەگە ، کە چرییە ئاوات ، هات .

چاوان لە سەر دیوارەکە بازی دا و دابەزیە سەر زەوییەکە ، کە بانگی ئاوات کرد ، هات .

٢- لەدوو ڕستەی سادە پێك دێت:

ڕاستە ئەگەر مەبەستیان ڕستەی سەرەکی بێت ، چونکە بە پێی پێناسەی ڕۆنانکارەکان بۆ ڕستە (( ڕستە گەورەترین دانەی زمانە لە ڕووی ڕۆنانەوە سەربەخۆ بێت ))[٨٧]. بەڵام ڕستەیەکی لاوەکی سەربەخۆ نییە بەندە بە ڕستەی سەرەکی یەوە .

٣- لەبەکارهێنانی زاراوەدا جیاوازی لە نێوانیاندا بەدی دەکرێت هەندێ بە ( تێکەڵ ) یان ( ئاوێتە ) هەندێکی تر بە ( ئاڵۆز ) ناوی دەبەن .

٤- جەخت دەکەنە سەر ئامرازەکان (مۆرفیمی گەیەنەر) ، کەچی هەندێ ئامراز چەند ئەرکێکیان هەیە و بەپێی بەکارهێنانیان لە چوارچێوەی ڕستەدا ئەرکەکانیان دەگۆڕێ چەند جۆرە بەیەکەوە بەستنێکی جیاواز نیشان دەدەن[٨٨]. دواتر باس لە فرە ئەرکی ئامرازەکان (مۆرفیمە گەیەنەرەکان) و واتای جیاوازیان دەکەین .

### ٥-٦-٣ بەشەکانی ڕستەی ئاڵۆز :

لە زمانی کوردی و ( ش . ز. ف ) دا ڕستەی ئاڵۆز لە سێ بەشی سەرەکی پێك دێت:

**١- ڕستەی سەرەکی** (Independent clause)

**٢- لاڕستە** (Dependent clause)

**٣- مۆرفیمی گەیەنەر** (Relative morpheme)

### ٥-٦-٤ ١- ڕستەی سەرەکی:

ڕستەی سەرەکی ڕستەیەکی سەربەخۆی دانەی سینتاکسییە وەك ڕستەیەکی سادەی ئاسایی رەفتار دەکات، پەیوەندی سینتاکسی لەگەڵ دەوروبەری خۆیدا نییە.

---

٨٧- محمد معروف فتاح، ١٩٩٠ : ٩٩-١٠٠.

٨٨- قەیس کاکل توفیق، ٢٠٠٢ : ٢٠٠.

وەك:

ئەو کەموترە ، کە باڵ گرد ڕەنگین بوی .          ئەو کۆترە ، کە فری جوان بوو .

پێشمەرگەگان ، کە رەسینە لامان فرە دڵیان خوەش بوی .

پێشمەرگەکان ، کە گەیشتنە لامان زۆر دڵیان خۆش بوو .

هەریەك لە ڕستەکانی (کەموتر ڕەنگین بوی ، پێشمەرگەگان فرە دڵیان خوەش بوی) ڕستەیەکی سەرەکی و سەربەخۆن پەیوەندی بە بەشەکانی تری ڕستەکانەوە نییە .

ئەو کەموترە ، کە باڵ گرد ڕەنگین بوی.




## ٥-٦-٥ ٢-لاڕستە :

(( ئەوبەشەیە لە ڕستەی ئالۆزدا کە هەرچەندە کەرستە پێویستیەکانی ڕستەی تێدایە ، بەڵام ناتوانێ وەك ڕستەیەکی تەواو سەربەخۆ بوەستێ ، بەڵکو لە ڕووی ڕێزمانەوە بە ڕستەی سەرەکییەوە بەندە . ))[٨٩] .

وەك:

نزاگەم، شایەد نزام وەلای خودا .[٩٠]          دوعادەکەم ، بەڵکو دوعام بگاتە لای خوا .

---

٨٩- شلێر ڕەسوڵ محەمەد ، ٢٠٠٤ : ٤١

٩٠- عبدالحسین بنی ویس ، بەراوردێکی نێوان ( زاری کرمانجی خواروو) و ( زاری گەرمەسێر) ، ١٩٨٥ : ٩٢

مانگێگە نەیمەسێ ، ئەڕایە دڵ گرانم .              مانگێکە نەم دیوە ، بۆیە دڵ گرانم .

دوژمن جورعەتی نما ، ئەڕایە خوەی داوەدەسەو.      دوژمن ورەی نەما بۆیە خۆی دابەدەستەوە

هەریەك لە ڕستەکانی ( شایەدنزام ، ئەڕایە دڵ گرانم ، ئەرایە خوەی داوەسەوە ).

پێویستیان بە تەواوکردنی واتای ڕستەکان هەیە ، چونکە هیچیان بەبێ ڕستە سەرەکی یەکانی ( نزاگەم وەلای خودا ، مانگێکە نیمەسێ ، دوژمن جورعەتی نما ) ڕۆنانەکەیان تەواو نابێت .

مانگێگە نەیمەسێ ، ئەڕایە دڵ گرانم




## ٥-٦-٧  ٣- مۆرفیمی گەیەنەر:

ئەو مۆرفیمەیە کە هەردوو بەشەکەی ڕستەی ئاڵۆز بەیەك دەگەیەنێت ، دەشێت لە هەندێك ڕستە مۆرفیمی گەیەنەر لە ڕۆنانی سەرەوەدا دەرنەکەوێت ، چونکە مۆرفیمێکی سەرپشکیە (Optional) لە دەرکەوتن نەك نەبوونی لە ناو ڕستەدا .

وەك:

کەموترەگە ، کە لە بان دارەگە بوی باڵ گرد       کۆترەکە ، کە لە سەر دارەکە بوو فری

راوێژ، کە  فرە خوەنی سەرکەفت .              راوێژ ، کە زۆر خوێندی سەرکەوت .

گەشبینی دالگ ، کە ماڵیان ها لە شار لە پرە خەفت.

گەشبینی دایك ، کە ماڵیان لە شارە لە ناکاو نووست .

کەموترەگە ، کە لەبان دارەگە بوی باڵ گرد




دەشێ مۆرفیمی گەیەنەر لە لاڕستەی دیارخەری لابدرێت ، چونکە مۆرفیمی خستنەسەری (ی) ئەو بۆشاییە پڕ دەکاتەوە کە مۆرفیمی گەیەنەر بەجێی دەهێڵێت ، بێ ئەوەی لە رووی ڕێزمانەوە کار ڕستەکە بکات[91] .

لە ڕووی واتاوەش هەمان مەبەستی پێشتر دەگەیەنێت .

وەك:

ئەو کەموترەی ، کە لە بان دارگە نیشت باڵ گرد .

ئەو کۆترەی ، کە لە سەر دارەکە نیشت فری .

ئەو کورەیلەی ، کە لە شارن سەرکەفتن .

ئەو کورانەی ، کە لە شار سەرکەوتن .

ئەوانەی ، کە چووینە گەردین دڵ خوەش بوین .

ئەوانەی ، کە چوونە سەیران دڵ خۆش بوون .

دەتوانین مۆرفیمی گەیەنەر لە هەریەك لەو ڕستانەی سەرەوە لابدەین بێ ئەوەی کار لە ڕستەکە بکات لە رووی ڕێزمان و واتاوە .

وەك:

ئەو کەموترەی لەبان دارەگە نیشت ، باڵ گرد .

ئەو کۆترەی لە سەر دارەکە نیشت فری .

ئەو کورەیلەی لە شارن ، سەرکەفتن .

---

٩١- شلێر ڕەسوڵ ، ٢٠٠٤ : ٤٢

ئەو کورانەی لە شارن سەرکەوتن .
ئەوانەی چووینە گەردین ، دلّ خوەش بوین .
ئەوانەی چوونە سەیران ، دلّ خۆش بوون .

بەڵام ئەو ڕستانەی کە مۆرفیمی خستنەسەری ( ی ) یان لەگەڵدانەبێت ناتوانرێت مۆرفیمی گەیەنەر لە ڕستەی ئاڵۆز لابدرێت ، چونکە بە لابردنی هەست بە لاوازی و ناتەواوی ڕستەکە دەکرێت[92] .

وەك:

ئاوات مناڵە ، کە شیعر خوەنی .
ئاوات منداڵە ، کە شیعر دەخوێنێ .
راوێژ کە ، ماموسای مەکتەبە فرەخاس ئویشێ .
راوێژ ، کە مامۆستای قوتابخانەیە زۆر باش دەڵێ .
کوردستان لە هویر مەکەن ، کە ئازاد بوی .
کوردستان لە بیرمەکەن ، کە ئازاد بوو.

بە لابردنی مۆرفیمی گەیەنەری (کە) کار لە ڕێزمانیەتی و کەم و کورتی واتای ڕستەکان دەکات .

وەك :

ئاوات مناڵە ، شیعر خوەنی .
ئاوات منداڵە ، شیعر دەخوێنێ .
راوێژ ماموسای مەکتەبە ، فرەخاس ئویشێ .
راوێژ، مامۆستای قوتابخانەیە زۆر باش دەڵێ .
کوردستان لە هویر مەکەن ، ئازاد بوی .
کوردستان لە بیرمەکەن ، ئازاد بوو .

---

٩٢- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە ئەم سەرچاوانە :
أ- شلێر ڕەسوڵ ، ٢٠٠٤ : ٤٣
ب- ئیراهیم عەزیز ئیبراهیم ، ١٩٨٠ : ٤١-٤٩

## جۆرەکانی ڕستەی ئاڵۆز :

ڕستەی ئالۆز لەزمانی کوردی دا گەلێ لایەنی ڕۆشن کراوەتەوە و تیشکی لێکۆڵینەوەی زانستی زۆر لایەنی ڕۆشن کردۆتەوە ، لەگەڵ ئەمانەشدا تا ئێستاش هەندێ تەم و مژ لە بابەتی ڕستەی ئالۆزدا هەر ماوە ، بە تایبەتی لە پۆلین کردنی جۆرەکانی ڕستەی ئالۆزدا ئەوەی گرفتەکە گەورەتر دەکات ئەوەیە جگە لە لایەنی ڕۆنانی گەلێ جار پشت بە بنەمای واتا دەبەسترێت بۆ پۆلین کردنی ڕستەکان بەتایبەتی لاڕستەی ( هۆی ، مەرجی ، مەبەست و ئامانج و ...... تاد ) بە ڕادەیەك ، کە زۆر تێکەڵی یەکتردەبن و دەشتێ نموونەیکی دیاری کراو لە لای ڕێزمان نووسێك سەر بە پۆلێك بێت ، کە جیاوازبێت لەگەڵ ڕێزمان نووسێکی تر تەنانەت ئەم دیاردەیەش لە سەرچاوە ڕێزمانیەکاندا بەدی دەکرێ [٩٣] .

ئاشکرایە لایەنی ڕۆنانی لە بەر چاو نەگیراوە ، واتا کراوە بە بنەمایەك بۆ پۆلین کردن ، ئەوا پشت بە سەلیقە واتایەکان یان کۆنتێکستی قسەکردن دەبەستێت ، تەنانەت پۆلین کردنەکە بەشێوەیەك دەردەچێت کە چەندی پۆلین بکەی ئارەزوو دەکەیتەوە کە جارێکی تر و بە شێوەیەکی تر و دوو بارە و سێ بارە پۆلینی بکەیتەوە .

لێرەدا ئێمە ناتوانین زانیاریەکی زیاتر بخەینە سەر ئەو خەرمانەی کە لەم بوارەدا کراوە و لە پێکهاتەی ڕستەی ئالۆز بدوێین . بۆیە هەوڵ دەدەین هاوبەشییەك بکەین لەچارەسەرکردنی ئەو لایەنە ئەو تەم و مژییەی ڕستەی ئالۆز و گرفتی پۆلین کردنەکان چارەسەربکەین ، پۆلینێکی نوێ بۆ ڕستەی ئالۆز دابڕێژین ، هەر چەندە ئەم پۆلینە بەشێك لە گرفتەکان چارەسەر دەکات ، بەڵام گرفت لە ناو وردەکارییەکانی کۆمەڵەی دووەم دا دەمینێت .

بە ورد بوونەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی ، کە سەرچاوە ڕێزمانیە کوردییەکان لاڕستەیان بەسێ شێوە ( کۆمەڵ ) پۆلین کردووە ، بەم شێوانە :

### کۆمەڵی یەکەم :

لاڕستەی دیارخەری :

ئەم ڕستانە لەسەر بنەمای سینتاکسی دوورلە ( واتا ) جیا دەکرێنەوە و ئەم تایبەتیانەی خوارەوەیان هەیە :

---

٩٣- قەیس کاکل ، ٢٠٠٢ : ٢٠٥

١- به هۆی ڕۆنانی سینتاکسیەکان دەناسرێتەوە .
٢- له ناو پێکهاتەی گرێی ناویدا کار دەکات و به شێکه لـه گرێـی نـاوی ، واتـه لـه لایـەن سەرەی گرێی ناوی بەند دەکرێ و دەبێته دیارخەری گرێی ناوی .
٣- له دەرەوەی گرێ ناویەکەدا هیچ ڕۆڵێك نابینێت ، به واتایەکی تر پەیوەندی ڕۆنانی لەگەڵ دەرەوەی گرێکه یان سەرجەم ڕستەکە نابەستێت .
٤- ئامرازی سینتاکسی تایبەت به خۆی هەیه ، که له زۆربـەی بارەکانـدا ( کـه )یـه و ئـەم ئامرازەش بەکارهێنانێکی سەرپشکی یه ، واته دەشێت له ڕۆنانی سەروەدا دەرنەکەوێت .
٥- بەپێی ئەرکی گرێ ناوییەکه ئەرك دەبینێت ، واته ئەگەر گرێ ناوییەکـه ئـەرکی بکـەری ببینێ ئەوا دەبێته دیارخەری بکەر(لاڕستەی دیارخەری بکەری ) و ئەگەر بەرکار بوو ئەوا دەبێته دیارخەری بەرکار .... تاد . تەنانـەت ئەگـەر گریـی ناوییەکـه خـۆی دیارخـەری سەرەی گرێیەکی تری ناوی بوو ئەوا دەبێته لاڕستەی دیارخەری دیارخەر ...... تاد .
٦- ئەم لاڕستەیه پێکهاتەکەی بەم شێوەیه یه ( که + ڕ ) به یارمەتی مۆرفیمی خستنەسەری ( ی ) بەسەرەکەوە دەلکێ و له هەندێ جاریش ئەگەر سەرەی گرێکه ناوی تایبـەتی بێـت ئەوا مۆرفیمی خستنەسەری ( ی ) لەگەڵدا بەکارنایەت [٩٤].
٧- ئەو لاڕستەیه دەشێت هەندێك جارله سـەرەی گرێیەکـه دوور بکەوێتـەوە و بچـێته پـێش کۆتای ڕسته ، واته شوێن گۆرکێ دەکات .
دەشێت له هەندێ باردا تەم و مژی واتایی درووست بکات ، واتـه لەیـەك کاتـدا بـۆ دوو گرێی ناوی ناو ڕسته بگەڕێتەوە بەتایبەتی لەو بارانەی له رووی لۆژیکەوە گونجانێکی واتایی له نێوان لاڕسته و دوو گرێی ناوی ناو ڕستەدا هەبێت .

وەك :
شازاد شنه دی ، که شەیوگی کەو له وەری بوی .
شازاد شنەی بینی ، که کراسێکی شینی له بەردا بوو.
٨- دەشێت له دانەیەك زیاتر لەم لاڕستانه به دوای یەکتردا ریزبکرێن و بـبن بـه دیارخـەر بـۆ هەمان ڕسته .

٩٤- د.قەیس کاکل تۆفیق ، بۆچوونێکی پراگماتیکی بۆ لا ڕستەی دیارخەری ، ٢٠٠٤ : ٢٢- ٢٧

وەك :

من ئەوكتاوە خوەنستمەو ، كە تن سنەد بويدەی ، كـە وەڕجلـە مانگێـك ، ئـەڕام هـاورد بويدەی، كە باس لە ئازادی مەردەم كەدن .

من ئەوكتێبەم خوێندەوە ، كە تۆ كڕی بووت ، كە مانگی رابردوو بۆت هێنام ، كە باسی لە ئازادی مرۆ ڤ دەكرد .

٩- ڕستەی ناو وەخن كراو بە هۆی ئەم جۆرە ڕستەیە درووست دەبێت .

وەك :

پشیەگە میوشەگە خوارد ، كە تواست بچودە كوناگە ، كە لە دیوارەگە بوی ، كە لایـەگی ڕمیابوی .... تاد .

پشیلەكە مشكەكەی خوارد ، كە دەیوویست بچێتە كونەكەوە ، كە لە دیوارەكـەدا بـوو ، كە لایەكی رووخابوو .... تاد .

شازاد دو چەرخێگ سەن ، كە چوار تایەر وە پیوە بوی ،

شازاد پایسكیلێكی كڕی ، كە چوار تایەی پێوە بوو ،

١٠- لادانی ئەم ڕستە یە هیچ كارناكاتە سەر ڕۆنانی ڕسـتە سـەرەكیەكە یـان راسـتربلێین گرێی ناوییەكە چ لەرووی ڕۆنانەوە چ لە رووی واتاوە ، كە ئەمەش بە هۆی ئەوەوەیە كە تـەنیا وەك دیارخەرێك ئەرك دەبینێت و دیارخەریش كەرستەیەكی لاوەكی ناو ڕستەیە .

ئەم جۆرە ڕستەیە كە ئەركی دیارخەری دەبینێت دەشێت بەم شێوەیی لای خوارەوە پـۆلینی بكەین :

**١- دیارخەری بكەر**

وەك :

هەولێر شارێگە ، كە گشمان قەرزارمین .

هەولێر شارێكە ، كە گشتمان قەرزارین .

**٢- دیارخەری بەركار :**

وەك :

ئیمە تن ناردمان ئەرا دەس نیشان كردنی شوونی گەردین ، كە لە گشمان زاناتربوی

ئێمە تۆمان نارد بۆ دەست نیشان كردنی شوێنی سەیران ، كە لە گشتمان زاناتربووی .

### ٣- دیارخەری ئاوەڵگوزارە :

أ - دیارخەری ئاوەڵگوزارەی کات :

وەك:

دویتەگە ئەو ساڵە لە داڵگ بوی ، کە هەڵبجە کیما واران کریا .

کچەکە ئەو ساڵە لە دایك بوو ، کە هەڵبجە کیمیاباران کرا .

دویکە ، کە هاتی وارن بوی .

دوێنێکە ، کە هاتی باران بوو .

ب- دیارخەری ئاوەڵگوزارەی شوێن :

وەك :

ئەنار لەو بازارە بسین ، کە تازە درس کریاس .

هەنار لەو بازارە بکڕە ، کە تازە درووست کراوە .

ئەو لەو کاریزە ئاو تێریت ، کە ئاوەگەی سەردە .

ئەو لەو کانیە ئاودێنێت ، کە ئاوەکەی ساردە .

راوێژ لە شار دەرس خوەنت ، کە پایتەختی کوردستانە .

راوێژ لە شار وانە دەخوێنێت ، کە پایتەختی کوردستانە .

### ج- دیارخەری ئاوەڵگوزارەی چۆنیەتی :

وەك :

من نیە تیونم جویر ئەو دریو دزوانانە بژیم ، کە ئەزیەد مەردوەم دەن .

من ناتوانم وەك ئەو دوو روانە بژیم ، کە ئازاری خەڵك ئەدەن .

### ٤- دیارخەری تەواوکەری کار :

وەك :

ئیمە ئەو کوڕەیلەیمینە ، کە کوردستان چەوی هاوەپیمان .

ئێمە ئەوکوڕەین ، کە کوردستان چاوی لێمانە .

**٥- دیارخەری دیارخەر**

وەك :

شازاد کورِ مەموم راوێژ ، کە زرِ برای باوگمە  نیە ناسدەم .

شازاد ی کورِی مامم راوێژ ، کە زرِ برای باوکمە نامناسێت .

**کۆمەڵەی دووەم :**

ئەو لاڕستانە دەگرێتەوە کە نابن بە دیارخەری گرێی ناوی ، بەڵکو زیاتر پەیوەستن بە کاری ڕستەکەوە ، دەشێت ئەم جۆرە ڕستەیە لەڕووی پۆلین کردنەوە بە ئاوڵگوزارە بچوێنیین. چۆن ئاوەڵگوزارە بەندە بە گرێی کاری و لە پۆلین کردنیشدا پشت بە لایەنی واتایی دەبەسترێت . وەك ( ئاوەڵگوزارەی کاتی ، شوێنی ، چۆنیەتی ، هۆی ، مەبەست ....تاد ) ، کە هۆکارێکی ڕۆنانیش نیە بۆ جیاکردنەوەیان و دەشێ هەموو جۆرەکانی لە گرێی بەند و هەندێ جاریش لە گرێی ناوی پێکبێن ، بە هەمان شێوە ئەم کۆمەڵەیەش پەیوەندیان بەکاری ڕستەکەوە هەیە . لایەنێکی واتایی ڕستە سەرەکیەکە روون دەکاتەوە. وەك ( هۆ ، مەبەست ، ئامانج ، ئەنجام ، مەرج ..... تاد ) .

لێرەشدا بەشێوەیەکی گشتی ناتوانیین جۆرەکانی ئەم کۆمەڵەیە لە سەر بنەمای ڕۆنان پۆلین بکەین و لەم قۆناغەدا دەبێ پشت بە واتا ببەستین .

وەك :

لاڕستەی ( مەرجی ، هۆی ، ئەنجام ، ئامانج ، ....... تاد ). ئەم پۆل کردنەش ژمارەی چەسپاوی نیە و بە پێی لێکدانەوەی ڕێزمان نووسەکان دەگۆڕێت بۆ نموونە دەشێت لاڕستەی ئامانج و هۆ ( ڕستەی شوێن کەتووی ئامانجی  و هۆی) لە لای ڕێزمان نووسێك لێك جیاکرابنەوە ،  لە لای ڕێزمان نووسێکی تر هەردووکیان کرابن بە یەك جۆر ڕستە .

١-   لەبەر ئەوەی لەم پۆلینەدا پشت بە واتاو چەمکی ڕستەکان دەبەستێت هێڵێکی جیاکەرەوەی روون لە نێوان جۆرەکانی ئەم پۆلە دانیە ، نەك بە ئاسانی لەیەکتر جیاناکرێتەوە تەنانەت زۆرجار وارێك کەوتووە کە ڕستەیەکی دیاری کراو لەلای ڕێزمان نووسێك بە ( هۆ )ی دانراوە لەلای ڕێزمان نووسێکی تر بە ( ئامانج ) لای یەکێکی تر بە ناوێکی تر ، ... تاد .

وەك :

ماگاگان فرە لەوەڕیان ، ئەڕایە قەوی بوین.            مانگاكان زۆر لەوەران ، بۆیە قەڵەوەبوون.

٢- ئەم پۆلینە لە بەر ئەوەی پشت بە واتا دەبەستێ بە هەر شێوەیەك پۆلینی بكەی جارێكی تر ئارەزوو دەكەیت بە شێوەیەكی تر پۆلینی بكەیتەوە.

٣- ئەم جۆرە لاڕستەیە بەند نیە  بە كەرستەیەكی دیاری كراو لە نێو ڕستە سەرەكی یەكە، بە ڵكو بەندە بە واتای گشتی شاڕستەكە . یان وردتر بڵێین بەندە بەكاری ڕستەكەوە .

٤- لەم جۆرە ڕستەیە مۆرفیمی گەیەنەر (ئامراز) بۆ بەستنەوەی لاڕستەكە بە شاڕستە بەكاردێت.

وەك : ( ئەگەر ، تا ، كە ، ئەڕا یە ، ..... تاد ) .

٥- لە بە كارهێنانی ئامرازەكانیشدا تێكەڵی بەدی دەكرێت ئامرازەكانی ( تا ، ئەگەر ، كە، ئەرا یە .... تاد ) دەشێت هەموویان ڕستەی ئاڵۆز دروست بكەن كە چەمكی مەرجی تێدابێت ئەمەش لە كاتێكدایە ، كە ئامرازی ( ئەگەر ) تایبەتە بە مەرج ، ئەمەش بارەكە ئاڵۆزتر دەكات ، چونكە رێگە لەوە دەگرێت كە پۆلینێكی وردی ئەم جۆرە ڕستەیە بە هۆی ئامرازەكانەوە بكرێت .

وەك :

ئەگەر ماڵت لە شوویشە بوی ، ماڵ خەڵك كوچەگ واران مەكە .

ئەگەر ماڵت لە شووشە بوو ، ماڵی خەڵك بەردباران مەكە .

ئەگەر پێی وەتی دووس ، لە ئەمرینەی بووس.

ئەگەر پێی ووتی خۆشەویست ( هاورێ ) لە ئەمری بوەستە .

تا مەقاش هەس ، دەس خوەت مەسزن.

تامەقاش هەیە دەس خۆت مەسووتێنە .

تا نەخوەنی ، ناویت وە هویج .            تا نەخوێنی نابیت بە هیچ .

كە گڕایەوە تێم ئەڕا لات .            كە گەڕایتەوە دێم بۆلات .

لەم ڕستانەی سەرەوەدا ئەگەر چوارچێوەیەكی بەكارهێنانی لەباری بۆ دروست بكرێت ئەوا دەشێت هەموویان بۆمەرج بەكاربێن .

٦- دەشێت خالێكی گرنگی جیاوازی نێوان ئەم كۆمەڵە و كۆمەڵی یەكەم (لاڕستەی دیارخەری) دەست نیشان بكەین : كە لاڕستەی دیارخەری بەندە بەناوێك لەو ناوانەی كە

لەڕستە   سەرەکی یەکەدا بوونیان هەیە ، بەڵام کۆمەڵی دووەم زیاتر بەندە بە کاری ڕستە سەرەکیەکەوە لەڕووی واتاییەوە لایەنێکی کردارەکە روون دەکاتەوە وەك هۆی ڕوودانی کارەکە مەرجی ڕوودانی کارەکە ، ئەنجامی ڕوودانی کارەکە .... هتد .

٧- ئامراز لەم جۆرە ڕستەیەدا هەرچەندە نابێتە بە شێك لە پێکهاتەی پاڕستەکان ، بەڵام لەگەڵ ئەم جۆرە لاڕستەیەدا دەبن و ڕۆنانی ڕستەکە بەند دەکات بە ڕستەیەکی ترەوە .

بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین جۆرەکانی ئەم کۆمەڵەیە بەم شێوەی خوارەوە دیاربکەین :

**لاڕستەی ( مەرجی ، هۆی ، ئەنجام ، پێوانە .........تاد . )**

**١-  لاڕستەی مەرجی :**

وەك :

ئەگەر نیە زانی ، دوپیر بدەوە جوانێگ .

ئەگەر نازانی ، دووپیر بدە بە گەنجێگ

ئەگەر وەرمەجڵس نەدیمە خوو پشت مەجلیس دیمە.            (گە.ئاڵ،ل٢٨)

ئەگەر ناو دانیشتنم نەبینیوە خۆ پشت دانیشتنم بینیوە .

ئەگەر دەور بکەفێگە ژن لە مانگ سیایس زمسان بزن برێگەوە.      (گە. ئاڵ، ل)

ئەگەردەور (دەسەڵات ) بکەوێتە دەست ژن لەمانگی رەشی زستان بزن دەبڕێتەوە

ئەگەر پێی وەتی دووس ، لە ئەمرینەی بوو س .

ئەگەر پێی ووتی خۆشەویست ( هاورێ ) لە ئەمری بوەستە .

ئەگەر پێی وەتی دووس ، لە ئەمرینەی بوو س



### ٢- لاڕستەی هۆی :

وەك:

ماگاگان فره له وەڕیان ، ئەڕایه قەوی بوین.  مانگاکان زۆرله وەڕان ، بۆیه قەڵەو بوون .

وه پا هاتن، ئەڕایه دواکەفتن.  بە پێ هاتن بۆیه دواکەوتن .

ماگاگان فره لەوەڕیان ئەڕایه قەوی بوین.




### ٣- لاڕستەی ئەنجام :

وك :

مانگێگه نیمەسێ، ئەڕایه دڵ گرانم .  مانگێکه نەم دیوه بۆیه دڵگرانم .

مانگێگه نیمەسێ ، ئەڕایه دڵ گرانم.



**٤- لاڕستەی پێوانە :**

وەك:

ئەو قەرە مەردوم هاتبوی ، کە سەگ ماڵ خاوەن خوەی نیەناسی .

ئەوەندە خەڵك هاتبوو ، کە سەگ ماڵ خاوەنی خۆی ناناسی .

ئەو قەرە شیرنە ، ئویشی شەکرە.

ئەوەندە شرینە دەڵێی شەکرە .

هەرچەند شیرەگە کەم بوی ، وەلی منالّەگە تیر خوەرد .

هەرچەندە شیرەکە کەم بوو ، بەلاّم مندالّەکە تێربوو .

ئەو قەرە مەردوم هاتبوی ، سەگ ماڵ خاوەن خوەی نیەناسی .




**٥- لاڕستەی پێچەوانە :**

وەك:

کە پایز وڵنگ دارئەکەفێ ، سەوزی نیە فەوتێ.    کە پایز گەلاّی دار دەوەرێت ، سەوزی نافەوتێ.

چای خوەرد هەرچەن ، کە حەزی لێ نەهات.    چای خوارد هەرچەندە ، کە حەزی لێ نەبوو .

که پایز وڵنگ دارئەکەفیٚ، سەوزی نیه فەوتیٚ.




**٦- لاڕستەی مەبەست:**

وەك:

ئەڕایه پویل دام تا کوڕم لەماڵ نەخەفیت. بۆیه پارەم دا تاکوڕم لەماڵ نەنووێت .

که چمه کارکردن تا دویته بخوازم. که دەچمه ئیشکرن تا کچه بخوازم .

که تیمه خوارد ئەرایه دویته بوینم. که دێمه خوار بۆ ئەوەیه کچه ببینم .

ئەڕایه پویل دام تا کوڕم لەماڵ نەخەفیت.




**کۆمەڵەی سێیەم :**

جگە لـەو جـۆرە لاڕسـتانەی کـە لـە لاپـەرەکانی پێشـوو ئاماژەیـان پێکـرا . سەرچـاوە ڕێزمانیەکان جۆرێکی تری لاڕستەیان دیاری کردووەکە هەنـدێ ئـەرکی سـەرەکی نـاو ڕسـتەی دەدرێتە پاڵ وەك لاڕستەکان ئەرکی بکەر یان بەرکار یـان ئـاوەڵگوزارەی کـات دەبیـنن ، بـە

واتایەکی تر لاڕستەکان نابن بە بە شێك لە بکەر و بەرکار .... تاد ، بەڵکوخۆیان ڕاستەوخۆ ئەم ئەرکە دەبینن .

وەك :

دیارە ، کە ئیوە وەچگەی دویاروژن .		دیارە ، کە ئێوە نەوەی دواڕۆژن .

راسە ، کە ئیوە کوردن .		راستە ، کە ئێوە کوردن .

لەم ڕستەیەدا ( دیارە) ، ( راسە ) گرێی کاری ڕستە سەرەکی کە یە و بکەرەکەی لە لاڕستەکە پێکهاتووە ، واتە (کە ئیوە وەچگەی دویاروژن ) ( کە ئیوە کوردن ) هەموو بە یەکەوە دەبێتە بکەری ڕستەکە . بەم شێوەی خوارەوە:

| | |
|---|---|
| کە ئیوە وەچگەی دویاروژن | دیارە . |
| **بکەر** | **کار** |
| کە ئیوە کوردن | راسە |
| **بکەر** | **کار** |

دیاری کردنی ئەم جۆرە ڕستەیەش لە سەرچاوە ڕێزمانیەکان دا بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە ، کە زیاتر بایەخ بە ڕۆنانی سەرەوە دراوە و ڕۆنانی ژێرەوە فەرامۆش کراوە . گەر سەیری ڕۆنانی ژێرەوەی ئەم ڕستانە بکەین ئەوا ئەو لاڕستانەی بکەری و لاڕستەی بەرکاری و لاڕستەی کاتی، ناوبراوی دەبن بە دیارخەر بۆ بکەر یان بەرکار یان ئاوەڵگوزارەیەکی کات کە لە ڕۆنانی سەرەوەدا دەرنەکەوتوون .

وەك :

ئەو شتە دیارە ، کە ئیوە وەچگەی دویاروژن .

ئەو شتە دیارە ، کە ئێوە نەوەی دواڕۆژن .

ئەو قسیێ یەم ژنەفتووە ، کە ئیوە وەچگەی دویاروژن .

ئەو قسەیەم بیستووە ، کە ئێوە نەوەی دواڕۆژن .

گەر دان بەم ڕۆنانەی ژێرەوە دابنێین ئەوا ئەو کۆمەڵەیەش یان ئەو جۆرە ڕستانە بوونیان نامینێ و دەکەونە ناو کۆمەڵەی یەکەمی ڕستەی ئاڵۆز .

لەبەر ئەوەی جۆری کۆمەڵەی سێیەم هیچ جیاوازیەکی نیە لەگەڵ جۆری کۆمەڵەی یەکەم هەمان پێکهاتەی کۆمەڵەی یەکەمی هەیە ، بەپێویستی نازانین لە سەری بدوێین و نموونەی لە سەر بهێننەوە.

لە مەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە بلێین ( دوو ) جۆری لاڕستەی دیارخەری لە کوردیدا هەیە ، ئەوانیش بریتین لە :

کۆمەڵەی یەکەم :
لاڕستەی دیارخەری : کە دەبێتە دیارخەری ناو و بە شێکە لە گرێی ناوی ڕستە سەرەکی یەکە .

کۆمەڵەی دووەم :
لاڕستەی ( مەرجی ، هۆی و ئەنجام ، ئامانج ، ...... تاد . ) دەگرێتەوە ، ئەمانەش بەندن بە کاری ڕستەکەوە .

**جۆرەکانی ڕستە لە ڕووی مەبەستەوە:**

هەندێك لە ڕێزمان نووسەکانی زمانی کوردی چوار جۆر ڕستەیان دەست نیشان کردووە ، ئێمەش لە (ش.ز.ف)دا هەمان دابەشکردن پەیرەو دەکەین[٩٥] .

١- ڕستەی هەواڵ گەیاندن
٢- ڕستەی پرسیاری
٣- ڕستەی فەرمان دان
٤- ڕستەی سەرسوڕمان

---

٩٥- بروانە ئەم سەرچاوانی خوارەوە:
أ- د. کوردستان موکریانی، ١٩٨٦ : ٦٠
ب- ئەبوبەکر عومەر قاد، ڕپرسیار ، ١٩٩٣ : ٤

### ١- ڕستەی هەواڵ گەیاندن :

ئەم جۆرە ڕستەیە ئەرکی گەیاندنی زانیاری و هەواڵە ، بە بیسەر (گوێگر).

ڕستەی هەواڵ گەیاندن خۆی لەخۆیدا بنچینەیە بۆ درووست کردنی هەموو جۆرە ڕستەیەك وە هەموو جۆرەکانی تری ڕستەش لە هەمان ڕستە دادەڕێژرێت.

وەك:

| | |
|---|---|
| راوێژ ئەڕا شار هات . | راوێژ بۆ شار هات . |
| کوردستان فرە رەنگینە . | کوردستان زۆر جوانە . |
| منداڵەگان لەبان وەفرەگە سوریان. | منداڵەکان لە سەر بەفرەکە خلیسکان . |

لە ڕستەی هەواڵ گەیاندن دەشێت کەرستەکانی ڕستە پاش و پێش (جێگۆڕکێ) بکرێت، بەمەبەستی پاتکردنەوە (تەئکید کردن)[96] .

وەك:

| | |
|---|---|
| کوردستان فرە ڕەنگینە. | کوردستان زۆر جوانە . |
| فرە ڕەنگینە کوردستان. | زۆر کوردستان جوانە . |
| چاوان دویکە خەفت. | چاوان دوێنێکە نووست . |
| دویکە چاوان خەفت. | دوێنێکە چاوان نووست . |

بەڵام ئەم پاش و پێشکردنە لە هەموو ڕستەیەکدا ڕێگای پێنادرێت، چونکە دەبێتە هۆی گۆڕانی تەواوی واتای ڕستەکە[97].

وەك:

| | |
|---|---|
| راوێژ ئاوات ماچ کرد . | راوێژ ئاواتی ماچ کرد . |
| ئاوات راوێژ ماچ کرد . | ئاوات راوێژی ماچ کرد . |
| چاوان گەشبین هاورد . | چاوان گەشبینی هێنا . |
| گەشبین چاوان هاورد . | گەشبین چاوانی هێنا . |

---

٩٦- قەیس کاکل ، ١٩٩٥ : ١٨

٩٧- (س . پ) : ١٨

**٢- ڕستەی پرسیاری:**

لەم جۆرە ڕستەیەدا قسەکەر ڕستەی پرسیاری ئاراستەی خۆی یان بیسەر دەکات، بەمەبەستی ئاشنابوون بە زانیاری و هەواڵی نویَ .

**جۆرەکانی ڕستەی پرسیاری:**

ڕستەی پرسیاری لە ڕووی شێوەی ئاوازی دەربرینەوە ، دەبن بە دوو جۆر:

١- بەیارمەتی ئاواز.

٢- بەیارمەتی ئامراز.

**١- پرسیارکردن بە یارمەتی ئاواز:**

لەم ڕستە پرسیارییە هیچ جۆرە ئامرازێکی پرسیاری لە ڕستە بەدی ناکرێت ، تەنها بەیارمەتی ئاواز ڕستەی هەواڵ گەیاندن دەگۆڕێت بۆ ڕستەی پرسیاری .

وەك:

راوێژ هات ئەڕا شار. ( ئاواز بەرەو خوارەوە )

راوێژ هات بۆ شار

راوێژ هات ئەڕا شار؟ ( ئاواز بەرەو سەرەوە )

راوێژ هات بۆ شار؟

گەشبین ئیوارە خەفت . ( ئاواز بەرەو خوارەوە )

گەشبین ئیوارە نووست.

گەشبین ئیوارە خەفت ؟ ( ئاواز بەرەو سەرەوە )

گەشبین ئیوارە نووست ؟

لە ڕستەی پرسیار ئاواز بخرێتە سەر کام لە کەرستەکانی ناو ڕستەکە ، ئەوا مەبەستی قسەکەر بۆ وڵامی ڕستەکە زیاتر دەپێکێت.

وەك :

کورەگان دو دو ئیوارە وەپا هاتن ؟ کورەکان دوو دوو ئێوارە بە پێ هاتن ؟

کورەگان دو دو ئیوارە وەپا هاتن ؟

کورەگان دو دو ئیوارە وەپا هاتن ؟

کورەگان دو دو ئیوارە وەپا هاتن ؟

کورەگان دو دو ئیوارە وەپا هاتن ؟

## ٢- بەیارمەتی ئامراز:

ڕستەی پرسیاری بە هۆی ئامراز لە کوردی دا ڕۆنانێکی سادەی هەیە و قسەکەر بیەوێ زانیاری لە هەر وشەیەکی ڕستەکە داوابکات . ئەوا ئامرازی پرس لە شوێنی ئەم وشەیە دادەنێ و لە هەواڵ گەیاندنەوە دەبێتە پرسیار ، واتە ڕستەی هەواڵ گەیاندن بە هۆی گوێزانەوەی وشەیەك یان گرێیەکی بۆ ئامرازی پرس ئەوا ڕستەکە دەبێتە پرس .

نموونە:

منالْگە دوێکە وە دو چەرخ لە باغەگەدا وەل شازاد وازی کرد .

منداڵەکە دوێنێکە بە پایسکیل لە باخەکەدا لەگەڵ شازاد یاری کرد .

کی دوێکە وە دو چەرخ لە باغەگەدا وەل شازاد وازی کرد ؟

منالْگە کەی وە دو چەرخ لە باغەگەدا وەل شازاد وازی کرد ؟

منالْگە دوێکە وەچی لە باغەگەدا وەل شازاد وازی کرد ؟

منالْگە وە دو چەرخ لە کوو ( کوە ) وەل شازاد وازی کرد ؟

منالْگە دوێکە وە دو چەرخ لە باغەگەدا وەل کی وازی کرد ؟

منالْگە دوێکە وە دو چەرخ لە باغەگەدا وەل شازاد چ کرد ؟

پەیامی پرسیاری قسەکەر بۆ بیسەر لەم جۆرە ڕستەیەدا زۆر بە ئاسانی و ئاشکرایی دەکرێت و هیچ تەم و مژێك لە نێوانیان ڕوونادات ، چونکە ئامرازەکانی (کی ، کوو/ کوورە ، کەی ، چەن ، ...تاد ) ڕاستەوخۆ پرسیار لە (کەس ، شوێن ، کات ، ڕادە، ...تاد) دەکەن.

وەك :

| | |
|---|---|
| کی هات ؟ | کێ هات ؟ |
| چەن کوڕ هاتن ؟ | چەند کرهاتن ؟ |
| کورەگان لە کو هاتن ؟ | کورەکان لە کوێ هاتن ؟ |
| کام گوڵ ڕەنگینە ؟ | کام گوڵ جوانە ؟ |
| کەی خەفت ؟ | کەی نووست ؟ |

جیاوی لە نێوان ئەو دوو جۆرەی ڕستەی پرسیاری بە شێوەیەکی گشتی لە وەدایە ، کە پرسیار کردن بە هۆی ئاواز داوای زانیاری ناکات ، بەڵکو وڵامەکەی بە ( بەڵێ ) یان ( نەخێر) دەبێت . بەڵام لە شێوەی دووەم دا داوای زانیاری دەکات و وەڵام بە ( بەڵێ ) یان ( نەخێر) نادرێتەوە .

بۆ نموونە :

پرسیار بە ئامراز :

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١- کی خەفت ؟ | (کەس) | وڵام | گەشبین |
| ٢- کەی خەفت ؟ | (کات) | وڵام | دویکە |
| ٣- چەن خەفت ؟ | (ڕادە) | وڵام | دو سەعات |
| ٤- لە کور/ کورە خەفت ؟ | (شوێن) | وڵام | لە باغەگە |

**پرسیار بە ئاواز**

وەك:

| | |
|---|---|
| ١- خەفت ؟ | ( بەڵێ ) |
| ٢- خەفت ؟ | (نەخێر) |

**٢- ڕستەی فەرمان دان :**

ئەو ڕستەیەیە کە کەسی یەکەمی (تاك ، کۆ) فەرمان بەسەر کەسی دووەمی (تاك، کۆ) دەکات بۆ ئەنجامدانی کارێك یان زیاتر یاخود ئەنجام نەدانی.

ڕستەی فەرمان دان لە ڕستەی هەواڵ گەیاندن درووست دەبێت ، واتە پشت بە گرێی کاری هەواڵ گەیاندن دەبەستێت بەم شێوەیە:

کاری فەرمان دان ⇐ مۆرفیمی (بـ ) + ڕەگی ڕانەبردوو + جێنـاوی لکـاو ( ∅ ، ن)[٩٨]

واتە هەموو گرێیەکی کاری ڕستەی فـەرمان دان مـۆرفیمی ( بــ ) دەچـێتە پـێش ڕەگـی داهاتووی کارەکە و جێناوی لکاو بە پێی کەس و ژمارە هەڵ دەبژێرێت ، ئەگەر جێناوی لکـاو بۆ کەسی دووەمی تاك بێت ئەوا (∅) دەبێت ، وە بۆ کەسی دووەمی کۆ ( ن ) دەبێت.

وەك:

| | | |
|---|---|---|
| تن ئەنارەگە بخوە . | (تاك) | تۆ هەنارەکە بخۆ . |
| کوڕەگە بێ ئەڕا ئەیرە. | (تاك) | کورەکە وەرە ئێرە. |
| ئیوە ئەنارەگان بخوەن. | (کۆ) | ئێوە هەنارەکان بخۆن. |
| کوڕەگان بێن ئەڕا ئەیرە. | (کۆ) | کورەکان وەرنە ئێرە. |

گرێی کاری فەرمان دان بۆ کەسی دووەمی تاك لەکۆتای کارەکە ( ە )یان (∅) دەبێت :

وەك :

| | |
|---|---|
| تن بخەف . | ( تاك ) |
| تن بخەفە . | ( تاك ) |
| ئیوە بخەفن . | ( کۆ ) |
| تن بوەسە . | ( تاك ) |
| تن بوەس . | ( تاك ) |
| ئیوە بوەسن . | ( کۆ ) |

### ٤- ڕستەی سەرسوڕمان:

(( ئەو ڕستەیەیە ، کەواتای هەی هۆلان و سەرسوڕمان لە ڕووداوێك ، هەواڵێك، شـتێك و ...هتد، دەگەیەنێت. ڕستەی خەبەردان ، پرسکردن و فەرمان کردن لەگەڵ بەهێزکردنی هێزیـان دا مانای سەرسوڕمان دەگەیەنن))[٩٩].

---

٩٨- ئومێد بەرزان برزۆ، ڕێزمانی جێناو لە شێوە زاری خانەقیدا ، ٢٠٠٦ : ٣٣

٩٩- د. کوردستان موکریانی، ١٩٨٦ : ٦٧

وەك:

| | |
|---|---|
| ئەنارەگە فرە تورشە ! | هەنارەکە زۆر ترشە ! |
| باغەگە ڕەنگین بوی ! | باخە کە جوان بوو ! |
| ئاوات ها لە ئاوایی ! | ئاوات لە دێ یە ! |
| خووشار هرت نی یە ! | (گە. ئاڵ، ل٨٦) |
| دووم و کلاش ئەڕا خوەی بچنێ ! | (گە.ئاڵ، ل١٠٥) |
| دۆم کەڵاش بۆ خۆی بچنێ ! | |

**ناکردن :**

کردەیەکی زمانی یە ، ئەرکی جێبەجێنەکردن و ڕەتکردنەوەی بەشێك یان هەموو ڕستەکەیە[١٠٠] .

مۆڕفمی ناکردن لە (ش.ز.ف)دا سێ جۆرە[١٠١] :

١- مۆرفیمی ( نە )

٢- مۆرفیمی ( مە )

٣- مۆرفیمی ( نێ ) یان ( نی )

**١- مۆڕفمی ( نە ):**

ئەم جۆرە مۆرفیمە ڕستە لە ئەرێ دەگۆڕێت بۆ نەرێ .

وەك:

| | |
|---|---|
| راوێژ هات. | (ئەرێ) |
| راوێژ نەهات . | (نەرێ) |
| ژنەگان هاتن ئەڕا شار. | ( ئەرێ ) |
| ژنەگان نەهاتن ئەڕا شار. | ( نەرێ ) |
| من مەکتوبەگە نوسانم. | ( ئەرێ ) |
| من مەکتوبەگە نەنوسانم. | ( نەرێ ) |

١٠٠- تارا عەبدوڵڵا ، ١٩٩٨ : ٨٣

١٠١- (س . پ ) : ٨٣-٨٤

دارەگە شکیا. ( ئەریٚ )

دارگە نەشکیا. ( نەریٚ )

## ٢- مۆرفیمی (مە):

ئەم مۆرفیمە بۆ نەریٚکردنی ڕستەی فەرماندان بەکاردیٚت ، هەموو ڕستەیەکی فەرماندانی ئەریٚ دەگۆڕیٚت بۆ نەریٚ ، ئەوا مۆرفیمی (مە) لە جیٚگای ( بـ ) دادەنریٚت ، جا ڕستەکە تاك بیٚت یان کۆ.

وەك:

تن / تە ئیوارە بخەفە. (ئەریٚ)

تن / تە ئیوارە مەخەفە. (نەریٚ)

ئیوە ئیوارە بخەفن. (ئەریٚ)

ئیوە ئیوارە مەخەفن. (نەریٚ)

لە هەندیٚ گریٚی کاری فەرماندانددا مۆرفیمی (بـ ) ی (ئەریٚ) دەگۆڕیٚت بۆ (نە)ی (نەریٚ).

وەك:

تن وە روژ کار بکە . (ئەریٚ)

تن وە روژ کارنەکە. (نەریٚ)

ئیوە وە روژ کار بکەن. (ئەریٚ)

ئیوە وە روژ کارنەکەن. (نەریٚ)

## ٣- مۆرفیمی ( نیٚ ) یان ( نی ) :

مۆڕفمی ( نیٚ ) ڕستەی ئەریٚ دەگۆڕیٚت بۆ نەریٚ بە مەرجیٚك کاری گریٚی کاریەکە داهاتوو ئیٚستا بیٚت.

وەك:

من ئیسە ئەنار خوەم. (ئەریٚ)

من ئیسە ئەنار نیٚ خوەم. (نەریٚ)

مۆڕفمی ( نی ):

((ئەم مۆرفیمە بۆ نەریٚ کردنی کاری بیٚ هیٚز بەکاردیٚت))[١٠٢] .

وەك :

مـن زانام .

مـن زانا نیم .

ئیوە دانان .

ئیوە دانانین

١٠٢- ( س. پ ) ، ١٩٩٨ : ٨٤

# پاشکۆ

( ژمارە و رێژەی نەتەوەکان لەسەرجەمی باشووری کوردستان دا - ١٩٧٧ )[١٠٣]

| پارێزگا | نەتەوە | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | سەرجەم | کورد | عەرەب | تورکمان | سریان | ئەرمەن | فەیلی | شەبەک |
| کوردستان % | ٣٣٠٣٣١٠<br>٩٩،٩٩ | ١٧٣٦٤٤٤<br>٥٢،٣٤ | ١٤١٠٩٨٣<br>٤٢،٧١ | ١٦٦٨٠٧<br>٢،٠٦ | ٢٦٣٢٣<br>٠،٧٩ | ١٧٩٩<br>٠،٠٤ | ٣٥٦٨<br>٠،١١ | ١٤٤٨٦<br>٠،٤٤ |
| هەولێر % | ٥٤٢٤٤٦<br>٩٩،٩٨ | ٤٦٥٢٨٣<br>٨٥،٨٥ | ٥٦٠٥٣<br>١٠،٣٤ | ٨٨٢٨<br>١،٦٣ | ٨٨٠٥<br>١،٦٢ | ١٠٩<br>٠،٠٢ | ٧٠<br>٠،٠١ | ٢١٩٨<br>٠،٤ |
| دهۆک | ٢٥٠٤٧٥<br>٩٩،٩٨ | ١٩٠٢٣٤<br>٧٥،٨٥ | ٤٦٣٦٠<br>١٨،٤ | ٤٩٨<br>٠،٢ | ١١٧١٧<br>٤،٦٨ | ٨٨٥<br>٠،٣٥ | ٤٣<br>٠،٠١ | ٧٣٧<br>٠،٢٩ |
| سلێمانی | ٦٩٠٥٥٧<br>٩٩،٩٩ | ٦٤٨١٧٣<br>٩٣،٩ | ٣٧٩٤٥<br>٤،٥٤ | ٨٤٤<br>٠،١٢ | ٤٣٨<br>٠،٠٦ | ٥٠ | ١٥١<br>٠،٠٢ | ٢٦٥٥<br>٠،٤ |
| کەرکوک % | ٥٧١١٩٢<br>٩٩،٩٨ | ٢٢٠٠٢٣<br>٥٢،٣٨ | ٢٤٦٩٣٨<br>٤٣،٢٣ | ٩٤٧٧٤<br>١٦،٥٩ | ٤٠٧١<br>٠،٧١ | ٥٩٨<br>٠،١ | ٧٤١<br>٠،١٣ | ٤٠٣١<br>٠،٧ |
| نەینەوا | ٩٤٨٠٤٢<br>٩٩،٩٩ | ١٤٠٤٤٦<br>١٤،٨٢ | ٧٩٦٠٧٣<br>٨٣،٤٤ | ٩٣٣٠<br>٠،٩٩ | ١١٠٣<br>٠،١٢ | ٩٣ | ٢٤٩٢<br>٠،٢٩ | ٣٣٨١<br>٠،٣٩ |
| دیالا % | ٣١٠٥١٨<br>٩٩،٩٨ | ٦١٩٦٩<br>١٩،٨ | ٢٣٣٣٢٤<br>٧٥،١٥ | ٧٤٥١<br>٢،٤٨ | ٨٩<br>٠،٠٣ | ٦٥<br>٠،٠٢ | ٩١<br>٠،٠٣ | ١٤٨٩<br>٠،٤٨ |

## نەخشەی ژمارە ( ا )

١٠٣- د.عەبدولا غەفور ، پێکهاتەی نەتەوەیی دانیشتوان لەباشووری کوردستاندا بەپێ ی سەرژمێری دانیشتوانی عێراق - ١٩٧٧ ، ٢٠٠٥ ، ١٤

**بەبۆچوونی ئێمە :**

١ - گومان لە وەدا نیە سەر ژمێری دانیشتوانی ساڵی ( ١٩٧٧ ) کە ( فەیلی )ەکانی لـە نەتەوەی کورد جیاکردەوە مەبەستی سەرانی رژێم شێواندنی رێژەی ڕاستە قینـەی گـەلی کـورد بەگشتی و فەیلیەکان بە تایبەتی بوو.

٢ - ئەم سەر ژمێریە نابێتە رێژەیەکی دیاری کراو بۆ ئەمڕۆ ، چونکە رێژەی دانیشتوان لە گۆڕاندایە .




نەخشەی ژمارە ( ٢ )

فواد حەمە خورشید ، لوڕ ... دانیشتوانی هەرێمی باشوری کوردستانی ئێـران ، گۆڤـاری ڕۆشنبیری نوێ ، ژمارە ١٠٩ : ١٠٠- ١٠٣ ، ١٩٨٦




نەخشەی ژمارە ( ٣ )

هیوازەندی، للكتابة باللهجة الفيلية ، الطبعة الثانية ، دار ئـاراس للطباعـة والنشـر، اربيـل ، ٢٠٠٧ بۆزانیاری ( لە بەرگی کتێبەکە نەخشەکەمان وەر گرتووە ) .

## تیکەیەگ لە یەك شعر فۆلکلۆریك

بەو بەو بەو بەو بەو بەو  خانمە خاسەگەم
پا بنیە وەبا دییە راسەگەم

☆ ☆ ☆ ☆

بەو تا بکەیمن بەو بەو دوسیمان لە نو
تن دار نارنج بەو بەو من دار لیمو

☆ ☆ ☆ ☆

جفتێ چاو دیری بەو بەو چوی پیاڵە چینی
لە خودام گەرەکە بەو بەو لە لید نەسینی

☆ ☆ ☆ ☆

قالی خریاگە بەو بەو بەو بەو دوشەگ لەبانی
دەزیران نشتگە بەو بەو زاوا لە شانی

☆ ☆ ☆ ☆

بەو بەو بەو بەو بەو بەو خانمە خاسەگەم
پا بنیە وەبا دییە راسەگەم

## تیکەیەگ لە یەك شعرەیلەی شێرکۆ بێکەس

### بشماردن[104]

ئەگەرتوانستد ، یەکە یەکە
بەڵگ ئەو دارە بشمارد .....
هەر چگە ماسیی گەپ و بویچگ ئەو رووارە
لە نوادەو ئەجمێ بشمارد ....
ئەگەرتوانستد ، لە وەرز کویچ
وەرەو خوار و وەرەو بان مەلەیلە ، ، ،
گست مەلەیلە بشمارد ....
منیش ئەو وەخت ، گفتد ئەدەم ،
هەر چگە قوورانیی ئەی خاك کوردستانە شیرینەسە ،
یەکە یەکە ، ئەڕاد بشمارم .

١٠٤- هیوا زەندی ، ٢٠٠٧ : ٦٧

# زوان یەکگرتگ کورد

زوان شناسنامەی هەر مللەتیگە و هەر مللەتیگ خاوە زوان رەسەن و تایبەت وە خوەی نەوگ نیەتویەنی دفاع لە شناسنامەی نەتەوەیی و نیشتمانی خوەی بکەی و دیر یا زوی لە ناو نەتەوەیل با لادەس یا دەسەلاتدار تاویەیگەو تەنیا ناوی لە میژوو یا تاریخ مینیگەو .

مللەت کورد یەکیگە لەو مللەتەیلە ك لە لایەن دوژمنەیلیەو تەقەلا کریاگە زوان و فەرهەنگەگەی لە ناو بووریەیگە و لە دریژایی تاریخ زواتەگەی خریاسە ناو قەفەس تاوانباریەو و کورد هەق ئەوە نەیاشتگە لە ری خونستن و نویسانن گوزارش یا تەعبیر لە نەتەوەی خوەی بکەیگ وەلی لە بان ئەویش گیان دفاع کردن لە ناو جەستەی هەر وەزینگی مەنگەسەو تویەنستگە گشت خوەیل نەیاریەل یا دوژمنەیلی لە بار بوویەگ.

پیمان نەدریاگە ك وەجددی ئەرا دروس کردن زوانیگ یەکگرتگ و ئستاندارد کار بکەیم وەلی لە شوین راپەرین ئەو فورسەتە ئەرامان پیش هاتگە وەتایبەت لە باشوور کوردستان تا جوور پرووسەیەگ ستراتیژی و نەتەوەیی کار لە بانی بکریەی و بووگە یەکیگ لە کارە فرەگرنگ یا موهمەگان ناوەندەیل یل مەرکەزەیل بریار وەدەس ............... .[١٠٥]

---

١٠٥- گوڵ سوو ، زوان یەکگرتگ کورد ، ٢٠٠٧ : ١٢

# ژنەیل ئەنفال کریاگ دویر خریاگ وەرەو بیاوان و غەریبی

پرۆسەی ئەنفال ئەوە توایگ ك ئێمەی کورد ، وەتایبەت قەڵـەم وە دەسـتەیل و ناوەنـدەیل ئەکادیمی و رووشنهوری وە دەیەها لـە یەکـەوداین و هەواڵپرسـین و بـەش تایبـەتی لـە بـانی بکەیمنەوە ، ناوەرووك و شیوەیپرووسەگەیش خوەی هەلگر ئشارەیگە لە مادەی خامە نوسیاننە ، ك کریەیگ هەر یەك لە قوناغـەگان پرووسەگە نسبەی تاکە فەوتیاگەگان پرووسەگە ، کارەگان ئەنفال ، هویر شۆفینی دژ ئنسانیەت ، کاریگەریە ئابووریەگەی ، بوار یا مەجالە سیاسیەگەی ، لایەنە ئەخلاقی و ئنسانیەگان ناو کارەسات ئەنفال ، ئەرا نموونە ئشارەت بەیمنەپی .

ئەوە ك بەندە توایگ لەی گوفتارە ك جەخت لە بانی بکەیگـەوە ، مەسـەلەی ئـەخلاقی و ئنسانیە لە رەگەز ژنەیل ئەنفال ك لە چوار چیوەی هجوومەگان حکومەیل بیاوان ك وە دیاری فرووشیانە ولاتەیل تر عـەرەب.

ئایە ئەیە چ تاکیگ بووگ ك ئادمیزاد سەرەرای رمانن زید و ماوای و لە ناو بردن هاوسەر وبرا و منالەیل خوەی دویرەو بخریەیگ وەر و ناوچەیەگ دویر ك هەر لە ئـاو و هەواگـەی بگـر هەتا زەوان و کلتوور و داب و نەریەت و خواردن و هەڵسو کەفتیان وەل ئیمە یا جیاواز بووگ .

ئایا بووگ لایەنی دەروینی کوردیگ پەروەردەی کانیەگان بنـار جەوزەڵـەگان و نیشـتەجای بەزم میوانداری ئاوای ك بیجگە لە زوان دالگی خوەی ك زوانیگ تر نەزانیگ و ئەنفال چیەگان مەنەی دیاری ئرا حاکمەیل بیاوان لە سعوودیە و سوودان ك نەك هـویچ خـالیگ هاەبـەش لـە مابەینمان نیە ، بگر سوودان لە کیشوەرمانیش نیە ، ك لەورا ژیان لە نـاو بیـاوان و تیـەنگی وبیرەحمی خوەر وە سەر چووگ .

ك پیاگەیلیان ریگە وە ژنەیلیان نیەدەن بانە دەیشت و جویر سەدەها سـاڵ وەرج لـە ئیسـە مامەلەت وەلیانا کەن . ئایا ئەو ژنەیلە بووگ بکرینە کـەنیز و جـویر خزمـەتکار مامـلـەت وەلیانا بکەن ؟

ئایا ئەو ژنەیلە تو بویشید زوان دالگی و لای لایەی شرین کوردەواریان لە هویر مەندویگ؟

تو بویشید ئەوانەی ئی ١٦ ساڵ گوزەیشتە قەترەیگ ئەسەر لە چاویان مەندویەگ ك ئـەرا چارەنویس خوەیان و ئەرا زیج و ماوای خوەشەویسیان نەرشانوینەی ؟

ئایا چەنیگ لە وانە وە دەس و پەنجەگانیان نان تەنویری و مایەکی ئەرا پیشمەرگەکردوین .
ئیمە تەنیا وە ئویشیم : ئەی خویشکەیل و دویتەیل و دایگەیل کورد دویرە ولاّت ، دوای وەخشین لە لیدان کەیم ، چوینکە واقع و نەیارەیل مەجال ئەوە نیەن ك بتویەنم شار وەشار و ئاوی و بیاوان و ە بیاوان لە شووندان بگەردیم و بارینەدانەوە ، وەلی ئەگەر خوداوەن پشتیوانمان بووگ گشت ئیمە کەفینمە مینەدان و وەپیرووزەوە تەماشادان کەیم ئەگەر لە لیدان مەندویگ .[١٠٦]

---

١- گوولّ سوو ، ژنەیل ئەنفال کریاگ دویر خریاگ وەرەو بیاوان و غەریبی ، ٢٠٠٨ : ٤١

## لیستی سەرچاوەکان:

### کتێبە کوردییەکان :

١- ئەورەحمانی حاجی مارف، رێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم، وشە سازی ، چاپخانەی (دار الحرية للطباعة) ، بەغدا، ١٩٨٨.

٢- د.ئەورەحمانی حاجی مارف ، زمانی کوردی ، لەبەر رۆشنایی فۆنەتیکدا ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

٣- د.ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم ، ڕستەی لێکدراوی شوێنکەوتوو خواز لەگەڵ ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری لە دیالێکتە ناوەندی یەکانی زمانی کوردی دا ، چاپخانی (دار الحرية للطباعة) ، بەغدا ، ١٩٨٠.

٤- د.ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم ، هەندێ ئامرازی سیناکسی لە زمانی ئەدەبی ئیمڕۆی کوردیدا ، بەرگی یەکەم ، چاپی یەکەم ، چاپخانەی (علاء) ، بەغدا ، ١٩٨٦ .

٥- تۆفیق وەهبی ، دەستووری زمانی کوردی ، جیزمی یەکەم، چاپخانەی (دار الطباعة الحديثة) ، بەغدا، ١٩٢٩.

٦- پروفیسۆر ك.ك کوردۆییێڤ ، رێزمانی کوردی بە کەرەسەی دیالێکتی کرمانجی و سۆرانی ، وەرگێرانی: د.کوردستان موکریانی ، ئەمینداریێتی گشتی رۆشنبیری و لاوان ، هەولێر ، ١٩٨٢

٧- جەمال نەبەز ، زمانی یەکگرتووی کوردی ، یەکێتی نەتەوەیی ی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا ، بامبێرگ ، ١٩٧٦.

٨- حەمید ئێزەد پەناە ، فەرهەنگی لەك و لوڕ، لێکدانەوەی بەراوردکردنی: مەحمود زامدار، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ، ١٩٧٨ .

٩- د.رەفیق شوانی ، چەند بابەتێکی زمان و رێزمانی کوردی ، چاپی یەکەم ، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی ، هەولێر، ٢٠٠١.

١٠- سەید عەلی میرنییا ، خێڵ و تایفەکانی عەشایەری کوردی ئێران ، وەرگێڕانی: شەوکەت شێخ یەزدین ، حەفتەنامەی گۆڵان ، هاوینەهەواری پیرمام ، ١٩٩٥.

١١- د.عەبدوڵڵا حوسێن ڕەسوڵ ، پوختەیەکی وردی ڕستە سازی کوردی ، هەولێر ، ٢٠٠٥ .

١٢- د.عەبدوڵڵا غەفور، پێکهاتەی نەتەوەیی دانیشتوان لە باشووری کوردستاندا، بە پێی سەر ژمێری دانیشتوانی عێراق (١٩٧٧) ، چاپخانەی شڤان ، سلێمانی ، ٢٠٠٥ .
١٣- غازی فاتیح وەیس ، فۆنەتیك ، چاپی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٨٤ .
١٤- فواد حەمە خورشید ، زمانی کوردی دابەشبوونی جوگرافیای دیالێکتەکانی ، وەرگێرانی: حەمە کەریمی هەورامی ، چاپخانەی (افاق عربية) ، بەغدا ، ١٩٨٥.
١٥- کریم زەند ، زمانی کوردی و هونەری وەرگێرانی ، چاپخانەی کامەران ، سلێمانی ، ١٩٧٧.
١٦- د.کوردستان موکریانی سینتاکسی ڕستەی سادە لە زمانی کوردی دا ، چاپخانەی (دار الحرية للطباعة) ، بەغدا ، ١٩٨٦ .
١٧- د.کوردستان موکریانی ، سینتاکسی ڕستەی تێکەڵ ، چاپی یەکەم ، دەزگای چاپ و بڵاوکراوەی ئاراس ، هەولێر، ٢٠٠٤.
١٨- د.کوردستان موکریانی ، سینتاکسی ڕستەی کوردی ، چاپی یەکەم ، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە ، هەولێر ، ٢٠٠٠.
١٩- لیژنەیەك لە وەزارەتی پەروەردە ، کتێبی زمان و ئەدەبی کوردی ، بۆ پۆلی چوارەمی ئامادەیی ، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە ، هەولێر ، ١٩٨٩.
٢٠- محمد امین زەکی ، کورد و کوردستان ، چاپخانەی دار السلامی ، بەغدا ، ١٩٣١.
٢١- محمد امین هەورامی ، زاری زمانی کوردی لە تەرازووی بەراووردا ، دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی ، بەغدا ، ١٩٨١ .
٢٢- محمد معروف فتاح ، زمانەوانی ، زانکۆی سەلاحەددین ، ١٩٩٠.
٢٣- میرشەرەف خانی بدلیسی ، شەرەفنامە ، وەرگێڕانی: مامۆستا هەژار، چاپی سێ — یەم ، دەزگای چاپ و بڵاوکراوەی ئاراس ، هەولێر، ٢٠٠٦ .
٢٤- نوری عەلی ئەمین، رێزمانی کوردی، چاپخانەی کامەران، سلێمانی، ١٩٦٠.
٢٥- نیعمت عەلی سایە ، رێزمانی کوردی ، زاری کەلهوڕی ، چاپخانەی شڤان ، سلێمانی، ٢٠٠٤ .
٢٦- هەژار ، چێشتی مجێوەر، چاپی یەکەم، چاپ و بڵاوکراوەی چاپخانەی شەرەف کەندی ، پاریس ، ١٩٩٧.

**نامەی ماجستێر و دکتۆرا :**

١- ئاواز حەمە سەدیق بەگیخانی ، ریزبوونی کەرستە لە زمانی کوردی دا ، نامەی ماجستێر، کۆلیجی ئاداب ، زانکۆی سەلاحەدین ، ١٩٩٦ .
٢- ئومێد بەرزان برزۆ ، ڕێزمانی جێناو لە شێوەزاری خانەقیدا ، نامەی ماجستێر، کۆلیجی پەروەردە ، زانکۆی کۆیە ، ٢٠٠٦ .
٣- ابوبکر عمر قادر، پرسیار لە زمانی کوردی دا ، نامەی ماجستێر، کۆلیجی ئاداب، زانکۆ سەلاحەددین ، ١٩٩٣ .
٤- بەکر عومەر عەلی ، بەستن و کرتاندن لە زمانی کوردی دا ، نامەی ماجستێر ، کۆلیجی ئاداب ، زانکۆی سەلاحەدین ، ١٩٩٢.
٥- تارا عەبدوڵڵا سەعید ، هەندێك لایەنی ڕێزمانی فەیلی ، نامەی دکتۆرا ، کۆلیجی ئاداب ، زانکۆی سەلاحەددین ، ١٩٩٨ .
٦- حاتم ولیا محمد ، فریێزی ناوی و فریێزی کاری لە کرمانجیی ژووروودا ، نامەی ماجستێر ، کۆلیجی زمان ، زانکۆی سلێمانی ، ٢٠٠٠ .
٧- دیار عەلی کەمال ، ڕێزمانی کوردی ڕوانگەیەکی بەرهەمهێنان و گوێزانەوە ، نامەی ماجستێر، کۆلیجی پەروەردە ، زانکۆی سەلاحەدین ، ٢٠٠٢ .
٨- ساجیدە عەبدوڵلافەرهادی ، ڕستە و پاش ڕستە ، تیڕوانینێکی ئەرکی ، نامەی دکتۆرا ، کۆلیجی ئاداب ، زانکۆی سەلاحەدین ، ٢٠٠٣
٩- شلێر ڕەسوڵ محەمەد بەرزنجی ، یاساکانی دارشتنی لاڕستەی دیارخەری لە زمانی کوردی دا ، نامەی دکتۆرا ، کۆلیجی ئاداب ، زانکۆی سەلاحەددین ، ٢٠٠٤ .
١٠-صباح رەشید قادر ، هەندێ لایەنی دەسەڵات و بەستنەوە (GB) لە زمانی کوردیدا ، کۆلیجی زمان ، زانکۆی سلێمانی ، ٢٠٠٧ .
١١-طالب حسین علی ، هەندێ لایەن لە پەیوەندی نێوان ڕستە و واتا لە کوردیدا ، نامەی دکتۆرا ، کۆلیجی ئاداب ، زانکۆی سەلاحەدین ، ١٩٩٨.
١٢-عەبدوڵڵا حوسێن ڕەسوڵ ، ناکردن لە کوردیدا ، نامەی ماجستێر، کۆلیجی ئاداب ، زانکۆی سەلاحەددین ، ١٩٩١ .

١٣-قەیس کاکل تۆفیق ، پەیوەندییەکانی نێو دەق ، نامەی دکتۆرا ، کۆلیجی ئاداب ، زانکۆی سەلاحەددین ، ٢٠٠٢.
١٤-قەیس کاکل تۆفیق ، جۆرەکانی ڕستە و تیۆری کردە قسەییەکان، نامەی ماجستێر، کۆلجی ئاداب، زانکۆی سەلاحەددین ، ١٩٩٥.
١٥-محمود فتح الله احمد ، کار تەواوکردن لە کوردیدا ، نامەی ماجستێر، کۆلیجی ئاداب ، زانکۆی سەلاّحەددین ، ١٩٩٨ .
١٦- یوسف شریف سعید ، کاری لێکدراو لە کوردی و فارسی - لێکۆڵینەوەیەکی بەراودکاری ، نامەی دکتۆرا ، کولیجی ئاداب ، زانکۆی سەلاحەددین ، ١٩٩٨ .

**گۆڤارە کوردییەکان:**

١- ئی .جی . ئار - هنری فیلّد ، هۆزەکانی کورد ، ورگێڕانی: حسێن احمد جاف ، گۆڤاری رۆشنبیری نویّ ، ژمارە: ١٢٥ ، ١٩٩٠.
٢- ساجیدە عەبدوڵلا فەرهادی ، مۆرفیمی ( ش ) لە کوردی ناوەڕاستدا ، گۆڤاری زانکۆ / گۆڤاری زانستی مرۆڤایەتی زانکۆی سەلاحەددین ، ژمارە: ٩ ، ٢٠٠٠ ، هەولێر
٣- فواد حەمە خورشید ، لوڕ... دانشتوانی هەرێمی باشوری کوردستانی ئێران ، گۆڤاری رۆشنبیری نویّ ، ژمارە: ١٠٩ ، ١٩٨٦
٤- د.قەیس کاکل تۆفیق ، ڕادە لە گرێی ناوی دا ، گۆڤاری زانکۆی سلێمانی- مرۆڤایەتی ، ژمارە: ١١ ، ٢٠٠٣ .
٥- د.قەیس کاکل تۆفیق ، بۆ چوونێکی پراگماتیکی بۆ لاڕستەی دیارخەری ، گوڤارا زانکویا دهوك ، پەربەندا (٧) ، هژمارا :٢ ،کانوینا ئێکیّ ، ٢٠٠٤
٦- د.محەمەد فاروق عومەر صدیق ، دەستوری پیّوەلکانی مرۆڤناو ((بەناوی باب و باپیر و لەقەبەوە لە زمانی کوردی و چەند زمانێکی تردا)) ، گۆڤاری رۆشنبیری نویّ ، ژمارە: ١١٨ ، ١٩٨٨ .
٧- محەمەد مەعروف فەتاح ، کار پولێنکردن بە پێی رۆنان ، گۆڤاری رۆشنبیری نویّ ، ژمارە: ١٢١ ، ١٩٨٩ .
٨- مراد حکیم محمد ، سیاسەتی راگواستنی کورد لە کوردستانی عێراق ، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی ، ژمارە: ٤٥ ، ٢٠٠٥.

٩- وريا عومەر ئەمين ، بناغەی سادەترين ڕستەی كوردی ، گۆڤاری رۆشنبيری ، ژمارە: ١١١ ، ١٩٨٦ .
١٠- وريا عومەر ئەمين ، هێز و ئاواز، گۆڤاری رۆشنبيری نوێ ، ژمارە: ١٢١ ، ١٩٨٩.
١١-هيمدادی حسێن ، دەربارەی لوڕەكان ، گۆڤاری رۆشنبيری نوێ ، ژمارە: ١١٣، ١٩٨٦.
١٢-د.يوسف شريف ، ڕادە و هەندێ تێبينی دەربارەی ڕادە لە زمانی كورديدا ، گۆڤاری زانكۆ، ساڵی سييەم ، ژمارە: ٤ ، ١٩٩٩.

**كتێبە عەرەبييەكان :**

١- احمد ناصرالفيلي، الكورد الفيليون بين الماضي والحاضر، مؤسسة شفق للثقافة والاعلام الكورد الفيليين .
٢- د.سعيد بشير اسكندر، الكرد الفيليون وحزب البحث (١٩٦٣-٢٠٠٣) منشورات مكتب الفكر والتوعية في الاتحاد الوطني الكردستاني ، ٢٠٠٥ .
٣- عبدالجليل فيلي ، اللور (الكورد) الفيليون في الماضي والحاضر، مطبعة وزارة التربية ، ١٩٩٩ .
٤- هيوا زةندي ، للكتابة باللهجة الفيلية ، الطبعة الثانية ، دار ئاراس للطباعة والنشر، اربيل ، ٢٠٠٧ .

**گۆڤارە عەرەبييەكان :**

١- زبير بلال اسماعيل ، اللر ولورستان في المصادر الجغرافية العربية القديمة ، مجلة زاطروس ، العدد: ١ ، ١٩٩٧.
٢- د.ساجيدە عبدالله فرهادی و د.طالب حسين علی ، گرێ و جۆرەكانی گرێ لە زمانی كوردی دا ، مجلة الاستاذ ، كلية ابن رشد ، جامعة بغداد ، ٢٠٠٦ .

**کتێبی فارسی:**


١-جعفر ختیال ، مجموعە اراو ، دربارە و ساکنین سرزمین ، پشتگوە ایلام، کتابخانە اسماعیلی ، چاپخانەی فرهنگ ، (١٣٦٩/١٩٩٠) .


**کتێبی ئینگلیزی :**


1- Fattah M .M  A generative grammar of Kurdish , university of Amsterdam.  1997.


**چاوپێکەوتن :**


١- د.جەمال ڕەشید ، لە بارەگای سکرتاریەتی (ی.ئا.ك) ، لە ٢٠٠٨/٣/٢٥ .

٢- مەدحی مەندەلاوی ، لە ماڵی خۆی لە هەولێر، لە ٢٠٠٧/٦/١٢.

٣- مەدحی مەندەلاوی ، لە وەزارەتی رۆشنبیری ، هەولێر، لە ٢٠٠٧/٦/٢٠.


**سەرچاوەی نموونەکان :**


١- عبدالحسین بنی ویس ، بەراوردێکی نێوان (زاری کرمانجی خواروو) و (زاری گەرمەسێر) ، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ ، ژمارە: ١٠٨ ، ١٩٨٥ .

٢ - عبدالمحسن بنی وەیس ، گەردانەی ئەڵوەن ، چاپخانەی (دار الحریە للگباعە)، بەغدا، ١٩٨٨.

٣- گوڵ سوو ، زوان یەکگرتگ کورد ، ، گۆڤاری گوڵ سوو ، دەزگای شەفەق ، ژمارە:٧، ٢٠٠٧ .

٤- گووڵ سوو ، ژنەیل ئەنفال کریاگ دویر خریاگ وەرەو بیاوان و غەریبی ، گۆڤاری گوڵ سوو دەزگای شەفەق ، ژمارە:٨ ، ٢٠٠٧ .

٥ - نەجم خالید ئەڵوەنی، پەند و قسەی نەستەقی کوردی شاری خانەقین، چاپی یەکەم ، چاپخانەی موکریانی ، هەولێر، ٢٠٠ .

# ملخص الرسالة الموسومة


( تركيب الجملة في اللهجة الفيلية ) .

تعني الرسالة - بشكل اساسي - بدراسة الجوانب اللغوية نحوية اللغوية في اللهجة الفيلية . وينتهج الباحث في هذه الدراسة منهج التوليدي — التحويلي والذي في جل مظاهره تتجنب الاهتمام باللهجات ، بل تقتني الدراسة والتحليل في خفايا اللغة الموحدة ، ومع ان هذه الدراسة تتناول الهجة محددة ضمن اللغة الرئيسية ، أرتأى الباحث مسايرة المنهج الوصفي لتحليل الجملة وتركيبها في اللهجة المذكورة أنفا"....

تتألف فصول هذة الدراسة من مقدمة و جيرة حول المشكلة المطروحة مع بيان منهج البحث المتبع .

وتهتم هذة الرسالة ببيان اللهجة الفيلية وحيثياتها الأتية ذكرها ضمن حدودها الدراسي في أقليم كوردستان والعراق .

وتتبع هذةالمقدمة ثلاثة فصول :

الفصل الاول : يتناول الباحث ... التعريف بالفيليين و تحليل مصطلح الفيلية والمواقع التي يستقرون فيها و حيثيات ثقافاتهم و معتقداتهم ومذاهبهم .

الفصل الثاني : يبحث عن دراسة العبارات النحوية وأنماطها والسمات الأساسية لها ، ثم عرض التبئير ( رأس العبارة ) والصفات السابقة واللاحقة لرأس العبارات.

وارتأى الباحث في الفصل الثالث :

عرض وتحليل أنواع الجملة وتركيبها ، منها البسيطة والمركبة والمعقدة وأنواع الجمل من حيث جوهرها الدلالي ، كالجملة الخبرية ، الاستفهامية ، الامرية ، وغيرها.

كما اننا استخدمنا ادوات ( مؤرفيمات ) النهي لتساعدنا في الحديث عن جملة النهي وضعنا ذالك بالأمثلة .

وبفضل اللة وتوفيق أكملنا هذه الرسالة أملين أن تسّد فراغاً في المكتبة الكردية لخدمة اللغة الكردية . واللة ولي التوفيق .

# Abstract

This study wich is entitled ( the structure of sentence in Faille's Dialect ) . The study in basic gives acare of study to aspects of syntax in the cycle of the Linguistics Fenomenous in the dialect . An introduction preceds the contain of the study which in the three chapter. And it is about the problem and the boundaries of the study, and any other things.

This study concerned with chomsry theory trans for mation grammar and uses or applied a synchronic approach for analy sing.

The first chapter concerned with the diffinition of Faille's and their homland and the background of their cultural.

The second chapter is about the structural of the phrases , their types, and all the modifiers which preced the heads.

The third chapter deals sentenes with the kinds of the sentence (simple, compound, complex ) and their structures and our last notion to say that this study has no conclusion.